ئەو پرسیارانەی تامەزرۆی زانینی وەڵامەکانیانم

# خودا بۆچی گەردوونی بەدیهێنا؟!

ئایا خودا پێویستی بە بەدیهێنانی گەردوون هەیە؟ خودا بۆچی مرۆڤەکانی بەدیهێنا؟ بۆچی خودا هەندێک بە ناشرینی دروست دەکات؟ بۆچی خودا هەندێک بە کەمئەندامی دروست دەکات یانخود ناتەندروستیان دەکات؟ پاش مردن خودا چۆن زیندوومان دەکاتەوە؟ چۆن ئینکاری بوونی خودا دەکەن؟ بۆچی پێویستە ئاشنابین بە ناوە جوانەکانی پەروەردگار؟



و. ئاوات عبدالله بابان




ناوی کتێب: خودا بۆچی گەردوونی بەدیهێنا؟

نووسینی: ئۆزکان ئۆزە

وەرگێڕانی: ئاوات عبدالله بابان

تیراژ : (٢٠٠٠ ) دانە

نۆبەی چاپ : یەکەم

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارە (٢٠٠٢)ی ساڵی ٢٠١١ ی پێ دراوە

---

# خودا بۆچی گەردوونی بەدیهێنا؟!

نووسینی

ئۆزکان ئۆزە

وەرگێڕانی

ئاوات عبدالله بابان

چاپی یەکەم

١٤٣٢ ك — ٢٠١٢ ز

# ئەو پرسیارانەی تامەزرۆی زانینی وەڵامەکانیانم

# وەڵامی نوێ بۆ پرسیاری نوێ

گەر یادت بێت لە کتێبی پێشودا پێم وتیت: "ئەگەر پرسیارێك لە مێشکدا دروست بێت، بێگومان وەڵامێکی هەیە.". " هەرگیز سڵ مەکەرەوە لەپرسیار کردن! دەست بگرە بە کلیلی پرسیارەکانەوە و هەتا دەتوانیت خودکێشی بکە! بەدوویدا وەڵامیکی مەزن دەردەکەوێت..."

ئەمانە تەنها شتانی سەرزارەکی نەبوون، بەڵکو لەبەرئەوەی بڕوام بەبابەتەکە هەیە وتوومن. هەروەها خودی خۆیشم هەتا ئەمڕۆ لە هیچ پرسیارێك سڵم نەکردۆتەوە.

بەتایبەت ئەوپرسیارانەی ئاوەزمیان دەوروژاند. هەمیشە باوەڕم بەوە هەبووە کەمادەم پرسیارێکم لادروست بووە بێگومان وەڵامێکیشی هەیە.

مادەم خودا پرسیارێکی خستوەتە بیرمەوە، ئەوا لەجیگایەکدا وەڵامێك چاوەڕوانم دەکات. وەلێ بۆ گەیشتن پێیان پێویستە هەوڵبدەین.

چونکە وەڵامەکان بەنرخن و مانەوەی نرخی هەر کاڵایەك، خوازیاری تێکۆشانە.

تێفکرە! ڕۆژێك لەڕۆژان وەڵامێکی زۆر بەنرخی پرسیارێك، کە هەرگیز بیرت لێنەکردۆتەوە، چنگت دەکەوێت. بەڵام دەست بەجێ

لەبەهاو نرخی تێناگەیت. ئەمە لەکاتێکدا، بەهای وەڵامگەلێك تاسەمەندی زانینیان بوویت و ئارەقت بۆ ڕشتوون، باش دەزانیت.

بۆ وێنە: ئەگەر لەبری زانای گەورە ئەدیسۆن کەچەندین تاقیکردنەوەی ئەنجامدا لەپێناوی دەستخستنی چۆنێتی دروستکردنی گڵۆپی کارەبا لە فانۆسێکی شوشەی بەتاڵکراو لە هەوا و داهێنانی ئەو گڵۆپە، دووکەڵکێش پاککەرەوەیەك بێ هیچ هەوڵدانێك بیرۆکەکە فێر بووایە، ئایا بەمە زۆر خۆشحاڵ دەبوو و وەدەستبەجێ دەستی دەدایە دروست کردنی گڵۆپ؟ هەرگیز وا هەست نەکەیت!

بەهای وەڵامی گەورە تەنیا لای کەسانێکە پرسیاری گەورەیان هەبێت و لەپێناوی دۆزینەوەی وەڵامدا خۆیان ماندوو بکەن ...

کەواتە وەرن با بەدوی پرسیارەکانمان بکەوین و بزانین چ وەڵامگەلێکی مەزن لەپشتیانەوەن...

لەکتێبی یەکەمدا بەناوی (بۆچی ناتوانم خودا ببینم)، هەوڵماندا وەڵامی چەند پرسیاێك دەربارەی پەروەرێنی مەزنمان بدەینەوە. پرسیارەکانیش بریتی بوون لە:

- بۆچی ناتوانم خودا ببینم؟
- خودا چەندە گەورەیە؟
- خودا لەکوێیە؟
- ئەدی کێ خودای بەدیهێناوە ؟

- بوونی خودا چلۆن بوونێکه؟
- بۆچی خودا یەکتایه؟
- خودا چۆن دەتوانێت لەهەمان کاتدا ئەو هەموو کارە ئەنجام بدات؟
- بۆچی خودا بۆبەرهەم هێنانی میوه ، درەختەکان دەئافرێنێت؟
- گەر خودا بەدیهێنەرە، ئەی سروشت چ کارەیه؟

لەگەڵ تۆدا پێکەوه بەدوورودرێژی قسەمان کرد و هەوڵماندا وەڵامی ئەم پرسیارانە بدۆزینەوه. ئەمانە پرسیارانێکی قورس بوون. بەڵام هەوڵماندا و ماندووبووین، بۆیه خودا وەڵامی پرسیاره ئەستەمەکانی بەدیاری بۆ ناردین.

ئێستا ئیدی هەردووکمان ئافرێنمان باشتر دەناسین. باوەڕێکی پتەوترمان به بوونی ئەو هەیه.

بەڵام دەبینم پرسیاری نوێت لادروست بووه، کەوایه وەره پێکەوه بچینه گەشتێکی دیکه.

وەدوی پرسیارەکان دەکەوین، بابزانین چۆن وەڵامێك چاوەڕوانمان دەکەن، هەموو پێکڕا دەیانبینین...

(( ئۆزکان ئۆزه ))

# خودا بۆچی گەردوونی بەدیهێنا ؟



خوای گەورە دەفەرموێت: " ئێمە ئاسمان و زەویو نێوانیانمـان بە بێسوودو لە خۆڕایی دروست نەکردووە. ئەمە گومانی ئەوانەیـە کەوا کافرن و باوەڕیان بە خواو پێغەمبەر نییە. هاوار بۆ ئەوانە لـە ئاگری دۆزەخ. " ص: ٢٧

دەکرێت تۆ ببیتە وێنەکێشێکی بەتوانا، کاتێك فلّچەکانت هێنـا بەسـەر پـەڕە سـپییەکەدا تابلۆیـەکی ڕەنگینـی گـوڵی جـوان، دارودرەخت و نیگاری جۆراو جۆر وا بکێشیت کـە هـیچ کەسێکی دیکە نەتوانێت هاوێنەی دروست بکات...

بەڵام ئەگەر ئێمە تـابلۆ کێشراوەکان نـەبینین، هـەرگیز بۆمـان دەرناکەوێت کە تۆ وێنەکێشێکی بەتوانایت ...تـەنیا خـودی خـۆت بە تواناکانت، دەستڕەنگینی و زیرەکییەکەت دەزانی.

ئەگەر بتەوێ کەسانی دیکەش ئەمانە بزانن و ببینن ئەوا پێویستە وێنە بکێشیت و نیشانی ئەوانیشی بدەیت. بۆ نمونە پێشانگایەك دەکەیتەوە و خەڵك بانگێشت دەکەیت. خەڵکیش دەبێت بێن و بەرهەمەکانی دەست ڕەنگینییەکەی تۆ ببینن. بەمجۆرە هەموو تێدەگەین تۆ چەندە سنعەتکارێکی مەزنیت.

ڕێزت لێدەگرن و بە حەیران بوونێکی زۆرەوە تەماشای سنعەتەکانت دەکەن. لەکارەکانت ورد دەبنەوە تاکو بزانن چۆن درەختێکت دروست کردووە، گوڵەکانت بەکام ڕەنگ بۆیە کردووە، چۆن کرا بەکێشانی دوو هێڵی سادە ئەسپێکی ئەوەندە بەوەفا و کەروێشکێکی ئەوەندە ئێسك سوك دروست بکەیت !...

ئەگەر نا هیچ یەکێك لە ئێمە نازانێت بە چ جۆرێك ئەم پەڕانەی فلچەکانیان بەرکەوتووە، گۆڕاون بە گوڵ و گوڵزاری جوان، درەخت و دیمەنی جۆراوجۆری وا کە هیچ کەسێك نەتوانێت هاوشێوەیان دروست بکاتەوە ... گەر ئەم چاکەیەت لەگەڵ نەکردینایە و کارەکانت بۆ نەخستینایەتە ڕوو، ئەوا هونەری وێنەکێشان و سنعەتکاریەکەی تۆ، بۆ ئێمە وەك شتێکێ نەزانراو دەمایەوە ...

بەڵێ بەهەمان شێوە، ئەگەر خودا مەیلی بەدیهێنانی گەردوونی نەکردایە، ئێمە هەرگیز ئەومان نەدەناسی، چونکە ئەو کاتە وەك هەموو شتێکی تری ناو گەردوون ئێمەش نەدەبووین...

هەروەها ئەو کاتە تەنیا خودی خۆی دەیزانی کە چلۆن بەدیهێنەرێکە...

## تەنها خودا هەبوو...

چونکە هیچ شتێك و هیچ کەسێك نەبوو، تەنها خودا هەبوو، هەروەها خودا بەرلەوەی هیچ شتێك بەدی بهێنێت هەر بەدیهێنەربووە.

بەڵام تەنیا زاتی خۆی ئەمەی دەزانی.

بەرلە هێنانەبوونی ئەو ئەستێرانەی ژمارەیان لە لمی کەنار دەریاکان زیاترە، توانا و هێزی خودا هەر ناکۆتابوو.



ئەو بەرلە هەڵسوڕانی ئەستێرەکانی لەو نێوەندی تاریکی ئاسماندا و بەبێ پێکداکێشان..

وەلێ ئەمەش تەنیا خۆی دەیزانی چۆن...

بەرلەوەی لەنێوان چەندین هەسارە و ئەستێرەی ئاسماندا زەوی هەڵبژێرێت، سەرپۆشی بکات بە بەرگە هەوایەکی شینی دڵگیر، ڕووی زەوی برازێنێتەوە بە دەریا، ئاوە بەخوڕەمەکان و چیاکان و پاشانیش نەشە و جموجوڵ بەرجەستەبکات بە بەخشینی ژیان، هەر لە ڕووەك و ئاژەڵ ومرۆڤ و هەموو چەشنە زیندەوەرارنی دیکە، ئافرێنی مەزن هەر خاوەنی ژیان بوو ...

هەر ئەوە دارای بەخشین و ئیدامە پێدەری ژیان بوو...

وەلێ تەنها زاتی مەزنی خۆی دەزانێ چۆن ..

بەرلە ڕازاندنەوەی ڕووی زەوی و باخ و باخچەکان بە گوڵ و گوڵزار...

بەرلە ڕەنگ کردنی ئەو گوڵانە بەڕەنگی جیاواز...



بەرلە پێدانی بۆنی گوڵ بە گوڵ و ڕەنگی ئاڵتونی بە گوڵە بەیبون...

وە بەرلە جێگیرکردنی ئەو بوکەڵۆچکانەی کە وەك بروسکەی ئاگر هەڵبەز ودابەز دەکەن، خواوەند هەر بەدیهێنەرێکی مەزن و بێ هاوتابوو.

بەڵام ئەمەش تەنیا زاتی مەزنی خۆی دەیزانی...

خواوەند ئەم ناو و سیفاتانە و چەندینی تری لەو شێوە هەبووە...

زۆر میهرەبان بوو لەگەڵ هەموو دروست کراوێکدا..

بەدیهێنەرێك بوو کە توانای بەدیهێنانی بەدیهاتوەکانی خۆی لەسەر شێواز و جۆری هەمەچەشن هەبوو.. بەوشێوەی مەیلی دەکرد زیندەوەرانی بەخێو دەکرد و خۆراکی بۆ بەدی دەهێنان..

زانای ڕەها بوو، هیچ شتێك نەبوو لەدەرەوەی بازنەی زانستی ئەودا بێت..

بیسەری هەموو دەنگ و سەدایەك بوو..

بینەری ڕەهای هەموو شتێکی نێو ڕووناکی یاخود تاریکی، دوور یاخود نزیك بوو، هەر خۆی بەدیهێنەری (بینین) بوو..

مرێنەری زیندووەکان و زیندووکەرەوەی مردووەکان بوو..

خەزێنەكانی بێ كۆتا، سەخاوەندمەندیی و بەخشندەیی بێ سنوور بوو..



ڕووناككەرەوەی هەموو تاریكییەكان بوو..

بڕوابەخشی دڵان بوو..

الرحمن بوو، الرحیم بوو..

بەڵام هەموو ئەمانە تەنیا زاتی مەزنی خۆی دەیزانی...

ئیدی پەروەرێنمان ویستی بناسرێت. ویستی هەموو ئەم جوانیانە ببینێت و پیشانی خەڵكیشی بدات بۆیە گەردوونی هێنایە بوون...

بەڵی ئەم گەردوونە پێكڕا، لەپێشانگایەكی گەورە دەچێت كە بەهەموو شتێكی ناویەوە دەرخەری ناوە جوانە لەژمارە نەهاتووەكان و سنعەتە بێ سنورەكەیەتی..

لە هەریەكێ لە تابلۆكانی ئەم پێشانگایەدا وردەكاری و گەورەیەكی تری سنعەتی ئەو دەبینین...

ئاسمانی شین تابلۆكەیە..

شەوە ساماڵ و ئەستێرەییەكان تابلۆیەكی تر..

باڵی پەپولەكان تابلویەكی تر..

درەختە بەردارەكان تابلۆیەكی دیكە..

وە هەموو بێچووە شێرە خۆرەکانی کە مەمکی دایکیان دەمژن تابلۆیەکی جیاوازی دیکەیە، دەرخەر و درەوشانەوەی شەفەقەتی بێ سنوری پەروەردگارە لەدڵی دایکاندا...

هەر کە چاومان کردەوە و لەچواردەوری خۆمان ڕوانی بە ئاشکرا گەلێ تابلۆی لەم شێوەیەی میهرەبانی ئەو دەبینین.

هەندێکمان دەڵێین (ماشاءالله).

"ماشاءالله! خودا مەیلی دروست کردنی پەپولەگەلێکی وەها جوان و قەشەنگ و ڕەنگاوڕەنگی کردووە و بەپێی ئەو ویستەی خۆی بەدیهێناون !"

هەندێکمان دەڵێین (سبحان الله) .

"سبحان الله! پاك و بێگەردی بۆ ئەو خودایەی ئاسمانی جوانی بێگەردی دروستکردووە و بە پەڵەهەورە ناسکەکان ڕازاندویەتیەوە، دوورە لە هەموو کەموکوڕی و ناتەواویەك، شادی وخۆشی دەبەخشێتە چاوی تەماشاکەرانی. بەڕاستی تەنیا زاتی ئەو زانایە بە تەواوی شتان."



هەندێك دەڵێن (الله أكبر).

"الله أكبر ! ئەو كەسەی ڕوخساری شەوەزەنگی بە ملیارەها ئەستێرە درەخشان كردووە، چەندە گەورەیە !.

ئەو كەسەی لە دەریای ئاسماندا مەلە بە ئەستێرەكان دەكات، چەندە گەورەیە !.

ئەو كەسەی یەك لەو ئەستێرانە كە (خۆرە) كردوە بەگڵۆپێكی مەزن و مانگیشی وەك مۆمێكی داگیرساو هەڵواسیوە بەڕاسەرمانەوە، چەندە گەورەیە ! "

# ئایا خودا پێویستی بە بەدیهێنانی گەردوون هەبوو؟



خوای گەورە دەفەرموێت : "هەموو شتێك لە هەموو بارێکدا پێویستی بە خودا هەیە، خودا پێویستی بە هیچ شتێك نییە" الإخلاص: ٢

چاوەڕوانم دەکرد پرسیارێکی لەم جۆرە بێتە بیرت.

چونکە لە دنیای مرۆڤدا هەرکارێك لەبەرخاتری پێویستییەك ئەنجام دەدرێت.

بۆ وێنە، کەسێك لە بازاڕ مێزێکی بەقاڵی دادەنێت و لیمۆی لەسەر دەفرۆشێت، لەبەرخاتری دەست کەوتنی پارە ئەم کارە دەکات.دروستترە بڵێین لەبەر ئەو پێویستیانەی کە بە پارە دەست دەخرێن، وەك:خۆراك، نان، ئاو، جلوبەرگ، ماڵ و هتد...

ئەگــەر ڕۆژێــك لــەڕۆژان بەشــێوەیەکی چــاوەڕوان نــەکراو، میراتیەکی زۆری بێ ئەندازە بۆ کـابرای لیمۆ فـرۆش بمێنێتـەوە، چیدی کاری لیمۆ فرۆشی ناکات چونکە ئیتر پێویستی بـە پـارە نییە.

وەلێ گەر بینیت سەرەڕای ئەوە، کابرا هەر بەردەوام بوو لەسەر کارەکەی و وەك جاران هـەوڵی دەدا، بۆت دەردەکـەوێت کـە ئـەم کابرایە بەهۆی پێداویستییەوە بە پارە لێمۆ نافرۆشێت.

بەڵکو لەبەرئەوەی حـەزو ویسـتی لـە لیمـۆ فرۆشـتن هەیـە ئـەم کارە دەکات.

ئەگـەر بێـت و ببینیـت بـەخۆڕایی لیمـۆ دەداتـە ئەوانـەی بـێ پارەن، بگرە پارە لە هیچ کەسێك وەرناگرێت، ئیدی بە دڵنیایـەوە تێدەگەیت کە ئەم لێمۆ فرۆشە لەبەر پێویستی ئەم کارە ناکات.

گەر لەو بپرسن :

ئایـا تـۆ چ پێویسـتیەکت بەوەیـە لـەبازاڕدا لێمـو بفرۆشـیت؟

لە وەڵامدا دەڵێت:

"خۆ لەبەر ئەوە نییە پێویستم پێی بێت، لیمۆ دەفرۆشـم! مـن پێویســتم بــەو پارانــە نییــە لەبەرامبــەر فرۆشــتنی لیمۆکــەوە وەریدەگرم! بەڵکو حەزم لەکاری لیمۆ فرۆشییە. پێشکەش کردنی لیمۆ بە خەڵکی بۆ من چێژێکی تایبەتی خۆی هەیە."

لیمۆفرۆشەکە بەهۆی ئەوەی ئارەزووی لەکارەکە هەیە، دەوڵەمەند و سەخییە ئەم کارە دەکات. لەبەرئەوەی دابەشکردنی لیمۆ و لەو ڕێگەیەشەوە دڵخۆشکردنی خەڵکی ئەم خۆشحاڵ و شادمان دەکات.

ئەگەر ئەو کارە نەکات هیچی لێ کەم نابێتەوە و کەس ناتوانێت پێی بڵێت:

"بۆچی لیمومان بەسەردا دابەش ناکەیت!" چونکە ئەو مەجبور نییە بەو کارە.

کەواتە لە دنیای مرۆڤیشدا کە دارای پێداویستی لەبن نەهاتووە، هەندێ جار بەبێ چاوەڕوانکردنی بەرامبەری ماددی و لەبەرچاوگرتنی سود، بڕێك کاری باش و خێری ئەنجام دەدرێت.

مەرد و دەوڵەمەندە مەردەکان سفرە ڕادەخەن و خوان دەڕازێننەوە، هەژارەکان تێردەکەن، پۆشتەیان دەکەنەوە... هیچیش مەجبور بەم کارە نین. بیکەن دەبێت و نەیشیکەن هەر دەبێت...

ناتوانرێت پرسیاربکرێت:" ئایا تۆ چ پێویستیەکت پێیەتی، خوانت ڕازاندۆتەوە و ئێمەت تێرکرد؟". گەر پرسیار بکرێت زۆر مایەی شەرمەزارییە. ئەوە گەر پرسیارکەر لەوانەبێت زگیان لە سفرەی دەوڵەمەندە خانەدانەکە تێرکردوو و بە جلوبەرگی ئەوەوە

دێن و دەچن، ئەوا ئیدی شەرمەزاری تێدەپەڕێنێت و دەچێتە قالبی سپڵەییەوە.

لەدەرچەی ئەم نمونەیانەوە دەڕوانینە وەڵامی پرسیارەکەمان.

پرسیارەکەمان چی بوو؟: "ئایا خودا پێویستی بە بەدیهێنانی ئەم گەردوونە هەبوو ؟"

## خودا "صمد" ە

یەکێك لەناوە جوانەکانی پەروەردگاری مەزن (الصمد) ە. الصمد واتە لەگەڵ ئەوەی هەموو شتێك پێویستی بە خودایە، خودا نیازی بەهیچ شتێك نییە.

خودا نەپێوستی بەم گەردوونە، نە بە بەدیهێنانی، نە بە هیچ شتێکی تر هەیە.

کاتێکیش گەردوون نەبوو، خودا هەر هەبوو. ئاشکرایە گەر کەسێك لەکاتێکدا هەبێت کەهیچ شتێکی دیکە بوونی نەبووە کەواتە پێویستی بە هیچ شتێکیش نییە.

ئایا خودایەك بەرلە بوونی خۆر هەبووە، چ پێوستیەکی بە خۆر یاخود مانگ هەیە؟

ئایا نیازی بەزەوی، هەوا، خاك، و ئاو هەیە کەلە نەبوونەوە هێناونیە بوون؟

خودا چ پێویستییەکی بە درەخت و میوەی درەختەکان هەیە؟

فڕینی باڵندەکان و گوزەری هەورە ناسکەکان چ سودێك بە بەدیهێنەری گەورە دەگەیەنن؟

خودا هیچ یەك لەمانەی لەبەر خاتری پێویستی بەدی نەهێناوە، بەڵکو لەبەرئەوەی وای خواستووە بەدیهێناون.

هەروەك لەبەشی پێشودا ڕوونم کردەوە، خودا گەردوونی بەدیهێناوە بۆ ئەوەی سنعەتە بێهاوتاکانی هەم ببینێت و هەم پیشانی کەسانی دیکەشی بدات.

دەکرا بەدیبهێنێت و دەکرا بەدینەهێنێت...

خودا نیازی بە هیچ کام لەوانە نییە.

بەڵام پەروەرێنمان بەدیهێنان و پیشاندانی سنعەتەکەی بە ئێمە و ناساندنی زاتی خۆی هەڵبژارد.

ئێمەش لەسایەی ئەوەوە تامی نیعمەتی (بوون)مان چەشت. گەردوونێکی مەزنی جوانی پڕلە سەرسوڕهێنەرەی وامان بینی و بڕوامان بەخودای بەدیهێنەری هەموو ئەمانە هێنا.

بینراوەکانمان بینی، سەداکانمان بیست.

ماچی کوڵمی ساوایەکمان کرد، دەستماندا لەناسکی پەڕەی گوڵێك... کاتێ دەستیشمان بەری کەوت خۆشترین بۆنی دنیامان بۆن کرد.

خۆشەوستی دایكمان چەشت، هەستمان بە شەفەقەتی باوكمان كرد.

فێربووین هەنگوین چەند شیرین وچەندە بەلەزەتە.

بۆمان دەركەوت وەرزی بەهار چەند شتێكی دڵڕفێنە.

وێنـــەی چــوار وەرز لەســـەر شاشـــەی بیلبیلـــەی چـاومانەوە تێدەپەڕێ...

هەرلەسایەی ئەمەوە بۆمان دەركەوت هیچ دەنكۆڵەیـەكی بـەفر لەوی دیكە ناچێت...

بەســەر سورڕماویەوە تەماشـای چۆنیەتی هاتنـە دنیـای سێوە لاسورەكانمان كرد...



لە فڕینی باڵندەکان و کۆکردنەوەی هەنگوینی هەنگەکانمان ڕوانی.

گوزەرمان کرد، یاریمان کرد، ڕاکشاین نوستین...خۆشمان ویست، خۆشیان ویستین، تاسەمان کرد، دڵخۆش بووین،لەکاتی ترسدا پەنامان بردەبەر خودا، پاڕاینەوە...

لەبەر ئەوەی ئێمەی بەدیهێنا و لەبوونی خۆی ئاگاداری کردین سوپاسی خودامان کرد...

وتمان "من هەم".

وتمان "من خودایەکەم هەیە".

## نە کەم دەکات و نەزیاد!

بیرێك لە خۆر بکەرەوە! لەسەر ڕوی هەموو تەنە تیشکدەرەوەکاندا دەدرەوشێتەوە، وانییە؟ لەڕوی شەونمی سەرگوڵێکدا، لەدەریا بەخوڕەکاندا، لە پەنجەرەی ماڵەکاندا، لە هەموو شوشەوات و شتەکانی تردا دەدرەوشێتەوە خۆری زێڕین. بە ڕوناکی و گەرمییەکەی لەهەر یەك لەو شتانەدا وەك خۆرێکی گچکە دەردەکەوێت. ئەریٚ باشە ئەم درەوشانەوە و دەرکەوتنە هیچ سودێکی بۆ خۆر هەیە؟

نەخێر!

باشــه گــەر خــۆر لــەهیچ شــتێکدا، تەنانــەت گــەر لەســەر گەردیلەکەیش نەدرەوشایەتەوە لەقەبارەکەی کەمی دەکرد؟ ئایا ڕووناکی وگەرمییەکەی کەمی دەکرد؟

نەخێر !

ئەگەر خۆر ڕوناکی و گـەرمی خـۆی نەدایەتـە زەوی، بێگومـان ئەوکاتە زەوی زەرەرمەند دەبوو نەك خۆر.

هـەروەك چـۆن وەرگرتنـی گـەرمی و ڕووناکی لەلایـەن زەوی، ڕووەك و ئاژەڵانـــەوە ســـودێك بـــەخۆر ناگەیـــەنێت، هـــەرواش وەرنەگرتنیان زەرەرێك بە خۆر ناگەیەنێت.

بەکورتی، ئەگەر گەرمی و ڕوناکی خۆر نەگەشتایە بـە ئێمـەش، خۆر دیسـان هـەر خـۆر دەبـوو، بـەڵام ڕوی زەوی لـەنێو سـەرما و تاریکیەکی بێ ئەندازەدا ون دەبوو.



بەهــەمان شـێوەی نمونــەی خۆرەکـە، توانسـت و سـنعەتی نـەبڕاوەی پـەروەرێنی مەزنمان لەسەر ڕوی زەوی و ئاسماندا وەك خۆرێك شەوقی دایەوە.

هەموو ئەستێرەکان، خۆرەکان، مانگەکان..

هــەموو گوڵــە دەم بەخەنــدەکانی ســەر زەوی، میوەکــان، درەختەکان،

لاسکی گەنمەکان، هەموو تۆوە تەقیوەکان..

چاوە بینەرەکان، گوێچکە بیسەرەکان، زمانە گۆیاکان، دڵە لێدەرەکان..



هەورەکان، دڵۆپەکانی باران، دانەکانی بەفر..

باڵندە فڕیوەکان، ئاسکە تیژ ڕەوەکان..



هەموو ئەمانە بریتین لە تیشکێکی بچوک لەنووری فراوانی سنعەتی بێهاوتا و لەبن نەهاتووی پەروەردگار..

خودی زاتی پیرۆزی پێویستی بە هیچ کام لەوانە نییە. نە بەهۆی ئەوەی گەردوونی بەدیهێنا سنعەت و توانستی ئەو فراوان بوو. نە ئەگەر بەدیشی نەهێنایە لێی کەم دەبووەوە.

خودا گەردوونی بەدینەهێنا نەك لەبەر ئەوەی پێویستی بێت، بەڵکو بەدیهێنا لەبەرئەوەی ویستی لەسەر بوو.

خوای گەورە دەفەرموێت :"ئێمە کە بمانەوێ شتێ لە نەبوونەوە دروست بکەین تەنها ئەوەندەیە پێی ئەڵێین: ببەو ئیتر ئەبێ. "النحل: ٤٠

## هەموو شتێك بۆ ئێمەیە...

لەگەڵ ئەوەی خوای گەورە نیازی بە هیچ شتێك نییە، وەلێ ئێمەی مرۆڤ موحتاجی هەموو شتێکی ناو گەردوونین...

خۆر بە ڕوناکییەکەی ڕۆژگاری ئێمە ڕووناك دەکاتەوە، مانگ بۆمان دەبێتە مۆمی شەوانمان.

ملیارەها ئەستێرە دەدرەوشێنەوە بەخاتری ئەوەی گەر بەشەو سەیری ئاسمان بکەین، تاریکی ناخمان دانەپۆشێت.

باران ئاوی باخچەکانمان دەدات، ئاوی کانی هەڵقوڵاوی نێوەندی تاشە بەردەکان ناخمان فێنك دەکاتەوە...

شاخەکان بۆ ڕاگرتنی زەویەکەمان هاتونەتە سەر ڕوی زەوی...

دارستانەکان بەشەو و ڕۆژ خراونەتەکار تاکو ئەو هەوایەی ئێمە پیسی دەکەین پاکی بکەنەوە. گەڵای لەژمارە بەدەری، لقی بێ ئەندازی سەر درەختە لەهەژمار نەهاتووەکان، بەوێنەی کارگەیەك

بۆ زیادکردنی ڕێژەی ئۆکسجینی هەڵمژراوی نێو سییەکانمان کاریان پێ دەکرێت...



ئێمەش پێویستمان بەدانەدانەی ئەمانە هەیە.

ئێمە "بەندەگەلی موحتاجی هەموو شتێک"ی "خوایەکی بێنیاز لە هەموو شتێک"ین.

هەموو ئەم گەردوونە بۆ ئێمە کاردەکات و خزمەتی ئێمە دەکات...

لە کاتێکدا مانگا وەک کارگەی بەرهەمهێنانی شیر لە وچاندایە، زۆر بەڕوونی دیارە کە "هەنگ" بۆ خزمەت کردنی کێ بەدیهێنراوە.

ئەو هێلکەیەی بەمریشکەکان دەکرێت بەشێوەیەکی گەلێک سەرسوڕهێن، بۆ ئەوەیە ئێمە سودی لێ وەرگرین.

کانزاکانی ناو چیاکان، خزمەتی گەورەمان پێشکەش دەکەن.

بەرلەوەی مرۆڤ پێ بنێتە سەر ڕوی زەوی، خودا ئەو ئاسنەی کە ئێمە بۆ ئەو هەڵناکەین، لە قوڵایەکانی ئاسمانەوە دابەزاندە سەر زەوی..

ئێمە پێویستمان بەهەموو ئەمانە هەیە...

ئێمە بەندەگەلی موحتاج بە هەموو شتێکی خودایەکی بێنیاز لە هەموو شتێکین...

وە خودا هەموو شتێکی لەبەر ئێمە بەدیهێناوە.

باشە ئەی ئێمە؟



# خودا بۆچی مرۆڤەکانی بەدیهێنا؟



بەرلە چەند ڕۆژێك کوڕە پێنج ساڵانەکەم لێی پرسیم: ئەرێ بابە خودا بۆچی منی کردوە بە مرۆڤ؟ لەبەرئەوەی وشەی "بەدیهێنا" هێشتا لەدنیای ئەودا مانایەکی بۆ خۆی پەیدا نەکردبوو، لەبری ئەو وشەی "کردی" بەکاریهێنا.

- دەبڵێ بابەگیان، خودا بۆچی منی کرد بە مرۆڤ؟

ئاه، وادەزانیت بوونە باوك شتێکی ئاسانە؟ دیسانەوە هەستم کرد کە هەمیشە بەبێ خۆئامادەکردن ڕووبەڕووی ئەم جۆرە پرسیارانە دەبمەوە.

دیسانەوە پێویست بوو وەڵامێکی ئەوتۆی بدەمەوە.

- لەبەر ئەوەی جوانترینیان مرۆڤە، بۆیە خودا کردیتی بە جوانترینیان !

- تێ نەگەشتیت!

- بۆچی؟

- واتە لەبەر ئەوەی مرۆڤ جوانترینە و خوداش تۆی خۆشەویست، ویستی وابوو ببیت بە مرۆڤ و بەمرۆڤ بەدیهێنایت.

- مرۆڤ جوانترینە؟

- بێگومان. مەگەر تۆ دەتەوێ ببویتایە بە بۆق؟

- نامەوێ.

- ئەختەبووت؟

- نامەوێ.

- جاڵجاڵۆکە؟

- هممم! ئەی نابێت هەم (مرۆڤ) و هەم (جاڵجاڵۆکە) ش بم؟

لەڕستیدا دەیویست بڵێت (پیاوی جاڵجاڵۆکەی) بەلام بە ئاشکرای بۆی نەدەدرکێنرا! گەر بموتایە (بەڵێ بەڵێ دەبێت)، ئەوکاتە ئیدی وەرە خۆت دەرباز بکە. چونکە بێ یەك و دوو دەیووت: کەوایە بۆچی خودا منی نەکردووە بە "پیاوی جاڵجاڵۆکە".

- نەخێر نابێت! ئەوەی دەیڵێیت تەنیا لە فیلمدا دەبێت. ئێستا دانەیەکیان هەڵبژێرە. جاڵجاڵۆکە یان مرۆڤ.

- بێگومان مرۆڤ! جوانترینیان مرۆڤە!



## وە خودا ، مرۆڤی بەدیهێنا

خۆر تەنیا یەکێکە لە ملیارەها ئەستێرەی ناو یەکێك لەو ملیارەها گالاکسیەی کە خودای گەورە بەدیهێناون.

جیاوازی ئەوتۆی نەبوو لەگەڵ ئەستێرەکانی دیکەدا. بۆنمونە ئەوەندە بە گەورە دانەدەنرا...

بەڵام قەدەری ئەم لە هەموو هیی هاوڕێکانی دیکەی ڕۆشنتر نوسرابوو. چونکە یەکێك لە هەسارە گچکە و خنجیلانەکانی چوار دەوری گۆی زەویەکەی ئێمەیە، ئەرکی ڕوناککردنەوەی گۆی ئەم زەوییە بەشێوەی گلۆپێکی مەزن درابوو بە خۆر.

خودا ئەندازەیەك دووری هێندە وورد و تەواوی لە نێوان خۆر و گۆی زەویدا داناوە، ئەوانەی هێندێك لەوە نزیکترین لەناو پلەیەکی گەرمی زۆردا دەسوتێنن و ئەوانیشی بەئەندازەیەك دوورترن بە چەندین پلە لەژێر سفرەوەن.

جیاوازی گۆی زەوی هەر ئەمە نەبوو. چیاکان، دۆڵە قوڵەکان و تاشە بەردەکان ڕووەکەیان ڕازاندەوە...

تاشە بەردەکان وردکران وگڵێکی نەرم لەسەر ڕووی تەختایەکان داخرا.

پاشان بەرگە هەوایەکی شینی دڵگیر کرایە چواردەوری دنیاکەمانەوە.

لەنێوەندی ئەم بەرگە هەوایەدا هەورگەلی هێندەی چیاکان گەورە دروستکران، لەم هەورانەوە نم نم باران دەباریە سەر زەوی.

دەریا، ڕووبار و ئاوە بە خوڕەمەکان لەدامێنی چیاکانەوە دەستیانکردە گوزەرکردن...

کانی و کارێزە سازگارەکان لەنێوەندی تاشەبەرد و زەویەوە هەڵقوڵێنران.

دەریامان پڕبوون و هەڵچوون، شەپۆلەکان کەوتنە سلاوکردن لە تاشەبەردەکان.

بەم جۆرە ئیدی زەوی لەهەموو هەسارەکانی دیکە جیاواز بوو، بەڵام دیسان وەك ئەوان ئەمیش مردووبوو، کەواتە ژیان و زیندەوەران لەسەر ڕووی زەوی نەبوون. وە خودای گەورە ژیانی بەدیهێنا لە دنیادا...

ژیان لەهەموو سوچێکی دنیادا فیچقەی کرد.

ئەو ژیانەی کە نە لە خاك، بەرد، ئاو، خۆر و نە لەهەسارەکانی دیکەدا هەبوو لەزەویدا بەدیهێنرا.



دەشتە بەرینەکان بە گژوگیای سەوز بەرگ پۆش کران.

گوڵە ڕەنگاوڕەنگەکان کرانەوە، درەختەکان کەم کەم باڵایان بەرزدەبوو.

دارستانەکانی قەد پاڵی چیاکانیان داپۆشی...

سەرزەوی پێکڕا گەشایەوە و ڕووی گەش بوو!

بەڵام هێشتا هەر مابووی.

خوای گەورە گیانلەبەرانی دروست کرد.

ئەو هەنگانەی لەنێوان گوڵەکاندا فیزەیان دەهات، ئەو بولبولانەی بەری بەیان لەسەر لقی درەختەکان نەغمەیان دەهۆنییەوە...

کەناری، چۆلەکە و بولبولەکانی بەدیهێنا...

ئاسکە کێویە چاوجوانەکان و شێرە سامدارەکانی لەناو دارستانەکاندا بەدیهێنا..

ئەسپی بەوەفای سەدا بەرزی نێو دۆڵەکان و ماینە تەوێڵ پانەکانی هێنایەبوون...

خودا لەناو دەریاکاندا ملیۆنەها جۆری ماسی ئافراند، لەوانە دۆلفینە دڵخۆشەکان، نەهەنگە زەبەلاحەکان و سورەماسیە گچکەکان...



ئەو گوێچکە ماسییانەی لەئامێزیاندا مرواری گەورە دەکەن، مەرجانە ڕەنگاڵەکان و ئەختەبوت و ئەستێرەی دەریا...



بەرخۆلە ئاسکەکانی بەدیهێنا...

ئەو مانگايانەی ڕۆژ تا ئێوارێ سەرقاڵی خواردنی گیای سەوزی تەڕوبەڕن، دواتریش کە تاریک و لێڵی ئێوارە دادێت بەخۆیان و کلکە بزوتەکانیانەوە دەگەڕێنەوە...

بەڵێ، ئێستا ئیدی زەوی بارێکی جیاوازی وەرگرتووە و هیچ هەسارە و ئەستێرەیەکی تریش لەو ناچن.

تەنانەت مانگی هەمیشە درەوشاوەی ڕاسەری زەویش، کە هەردەم وەك مۆمێك شەوە زەنگەکان ڕووناك دەکاتەوە، دارای گەردیلەیەك لەم زیندەگیانەی زەوی نییە...

زەوی وەك تابلۆیەکی زۆر سەرنج ڕاکێش بوو، بەڵام ئەم تابلۆیە هێشتا تەواو نەبووبوو.

وە ئافرێنی مەزن مرۆڤی بەدیهێنا!

# جیاوازی بوون به مرۆڤ

خودا مرۆڤی بەدیهێنا! هەروەها کۆمەڵێك تایبەتمەندی بەخشیە مرۆڤ کە بە هیچ بەدیهێنراوێکی دیکە نەدرابوو.

بۆ نمونە، ئەو "چاو"انەی بەخشی بووی بە ئادەمیزاد، زۆر جیاوازبوو لەوانەی بەخشیبووی بە گیاندارێکی وەك مانگا!

نەخێر! من باسی گەورەیی، شکڵ و ڕەنگی چاوەکە ناکەم! بەڵکو باسی (بینین)ی چاو دەکەم!

بۆ مانگایەك، لە بەری بەیانەوە هەتا لێڵای ئێوارە لەناو مەزراکاندا سەرگەرمی گیاخواردنە، خۆشترین و بەنرخ ترین شت لای ئەو چەپکێك گیای بێ تامە.

پێدەچێت چاوی مانگاکە (گوڵاڵەیەك) ببینێت، وەلێ جوانیەکەی نابینێت.

هیچ چێلێك ناڵێت ئەم گوڵاڵە سورە چەندە قەشەنگە و جوان ڕێکەوتووە لەنێوان گیا سەوزەکاندا! خودا چەند جوان ئەم گوڵاڵەیەی دروست کردووە!

چاوە گەورەکانی مانگا ئەم جوانیە نابینێت...

ئەوە تەنیا چاوی ئادەمیزادە دەتوانێت هەست بەم جوانییە بکات.

خـودا "گوێچـکە"ی زۆر جیـاوازی بەخشـیوە بـە ئـادەمیزاد و گوێدرێژ.

نـەخێر! بێگومـان ئـەمجارەش مەبەسـتم لـە جیـاوازی شـکڵ و گـەورەیی گوێچـکەی ئـادەمیزاد و گوێدرێـژ نییـە. چـونکە هـەموو کەسێ ئەوە دەزانێت.

بێگومان گوێچـکەکانی گوێدرێـژێك سـەدای نەغمـەی بولبـولێکی دەنـگ خـۆش دەبیسـتێت سـپێدەی بـەیانی لەسـەر پیرەلقـی دار سـێوێك گـۆرانی دەڵێـت، دەیبیسـتێت. وەلێ هـیچ گوێدرێـژێکی سەرزەویمان نەبینی بە بیستنی ئەو دەنگە ئەفسـوناویەی بولبـول لە هۆش خۆی بچێت، هەستی شیعر نوسینی بجوڵێت...

ناڵێت " خواوەنـد گـۆرانی چـەند خۆشـی فێـری ئـەم بولبولانـە کردووە، دەنگیان چەندە هەست بزوێنە! "

چــونکە گوێچــکەکانی گوێدرێــژ گەرچــی دەنگــی بولبــولیش ببیسـتێت بـەڵام درك بـە خۆشــی دەنگیـان ناکـات. ئـەوە تـەنها گوێچکەی مرۆڤە درکی پێدەکات.

"لوت"ی هیچ مرۆڤێك هێندەی لوتی سەگ بەباشی بۆن ناکـات. وەلێ هەرگیز نابینیت سەگێك بچێت بۆنی گوڵێك بکات.

هیچ سەگێك بە بۆنکردنی گوڵێك مەست نابێت و ناڵێت:

" خـودا گـوڵێکی بـەم جوانییـە دروسـت کـردووە و ئـەم بۆنـە خۆشەی کردووە بەبەردا "

گەرچی لوتی سەگ بۆنی گوڵیش بکات بەڵام هەست بە خۆشـی ئەو بۆنە ناکات.



تەنیا لوتی ئادەمیزاد هەست بەو خۆشییە دەکات.

خـودا بـە ورچـەکانیش دەم، زمانێـک بـۆ چەشـتن و گەدەیـەکی برسی بەخشیوە.

ورچـەکان هـەرمێ دەخـۆن و مرۆڤـەکانیش. بگـرە دەڵـێن ورچ باشترین هەرمێ بۆ خواردن هەڵدەبژێرێت.

کەوایە ورچیش وەك ئادەمی دەتوانێت تامی هەرمێ بکات.

بەڵام هیچ ورچێك لەکاتێکدا هەرمێیەك دەخاتە دەمییەوە و دەیجوێت ناڵێت " ماشاالله تام و بۆی ئەم هەرمێیە چەند خۆشە!". ئەوە ئەگەر هەرمێی درەختی لای ئەستێلەکە بێت ئەوە مەیخۆ تەنیا لەلایەوە بنو بەسە.

من زۆر حەزم لەبۆنی ئەو جۆرەیە کە پێی دەڵێن "هەرمێی فرەنك". خودا چەند هەرمێی بەلەزەت بەدی دەهێنێت لەسەر لقی ئەم درەختانەی کە خواردنیان بێجگە لە ئاوێکی قوڕاوی ناخی زەوی هیچی دیکە نییە، تامی چەندخۆشە، بۆنی چەندخۆشە! .

هەرچەندە زمانی ورچەکە تامی هەرمێیەکە بکات، وەلێ تامە ڕاستەقینەکەی پشتی ئەو تامە ناکات.

تەنیا زمانی ئادەمیزاد چێژی شیرینی ناسینی ئەو خواوەندە دەکات کە بە میهرەبانی خۆی میوەی بەتام و هەمە جۆرمان لە ڕێگەی درەختەکانەوە پێشکەش دەکات.

چاوی مرۆڤ لە چاوی مانگا،

گوێچکەی مرۆڤ لە گوێچکەی گوێدرێژ،

لوتی مرۆڤ لە لوتی سەگ ،

هەروەها زمانی مرۆڤ لە زمانی ورچەکان جیاواز دروست کراوە.

مرۆڤ، ئەوەی ئەوان نایبینن، دەیبینێت. ئەوەی نایبیستن، دەیبیستێت. ئەو بۆنەی درکی پێناکەن، درك پێدەكات.

هەروەها لەبەرامبەر بینین، بیستن و هەستکردن بەهەموو ئەو جوانیانە توانای ئەنجامدانی ئەو کارانەشی هەیە کە هەرلە مێرولەکانەوە تاکو خۆرەکان ناتوانن ئەنجامی بدەن.

دەڵێت: " پەروەرێنم چەندە جوان بەدیهێناوم! "

دەڵێت:" توانست و سنعەتی ئەو چەند مەزنە! "

دەڵێت:" سوپاس وستایش بۆ ئەو خوایەی چواردەوری پڕکردووین لە نیعمەتی هەمەجۆر! "

کەسێك بەدیهێنەری خۆی بەم شێوەیە بناسێت، بێگومان گوێڕایەڵی "نێردراو"انیشی دەکات.

گوێ ڕادەگرن لە وتەی ئەو نێردراوانە. باوەڕدەهێنن بەو بەڵگە و ئایەتانەی خواوەند ناردوێتی بۆ نێردراوانی.

دووردەکەونەوە لەو قەدەغەکراوانەی زاتی ئەو قەدەغەی کردوون.

فەرمانەکانی پەروەردگار بەجێ دەهێنێت. بەندایەتی دەکەن و زۆر ناوی ئافرێنمان دەهێنن...

خودایش هەم ئەو بەندانەی خۆش دەوێت و هەم لەبەرئەوەی بە نابینا، کەڕ و بێهەست لەبەرامبەر ئەو هەموو بەدیهێنراوە

ناوازانـەی زەوی و ئاسمانـدا نەماونەتـەوە، دیـاری ڕێزلێنانیـان پێدەدات.



لێرەوە دەیانگوێزێتـەوە بـۆ جیهـانێکی گـەلێك جـوانتر، گـەلێك ناوازەتر. کەسـانێك لێـرە کاتێك میوەیـەکی بـەتام دەخـۆن نـاوی خودا دێنن، پەروەرێنیان دێتەوە یـاد، لـەوێ بـۆ هـەتا هەتایـە بـە میوەی هەمەچەشن خەڵات دەکرێن.

کەسـانێك لێـرە چـاویان بـە گـوڵێکی جـوان دەکـەوێت و بەدیهێنەرەکەیان دێتـەوە بـیر، لـەوێ هەتاهەتایـە لـەناو باخچـەی گوڵ وگوڵزاردا دەژین.

کەسـانێك لێـرە زوو زوو باسـی گـەورەیی زاتـی خـودا دەکـەن، لـەوێ ڕووبـەڕووی نیعمەتگـەلێکی بـەنرخ دەبنـەوە کـە شـیاوی گەورەیی ئەو بێت.

ئـەوان لـەویٚ بـۆ هەمیشـە لـە نێوەنـدی خۆشـیەکاندا ژیانیـان بەسەر دەبەن...

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: " ئەوانـەی باوەڕیـان هێنـاوە و کـردەوەی چـاکیان ئەنجامـداوە، ئـەوە لەمـەودوا دەیانخەینـە باخەکانی بەهەشتەوە کە چەندەها ڕووبار بەژێر درەخت و بەردەم کۆشـکەکانیاندا گوزەردەکـەن، ژیـانی هەمیشـەی و نـەبڕاوە و بەردەوام تێیدا دەبەنە سەر. ئەوە بەڵێنێکی نەبڕاوی خواییە، جا کێ هەیە ڕاستر ودروستر لـەخودا بـەڵێنی خـۆی بباتـە سـەر !؟"

النساء: ١٢٢

# بۆچی خودا هەندێك بەناشیرینی دروست دەكات؟



ئایا تۆ حەزت لە كەرەوزە؟ من تاكو ئەم تەمەنەیشم هیچ كەرەوزم نەخواردووە. گەر بۆ جارێكیش بێت تامم كردبێت، حەزم لەتامەكەی نەكردووە. بێگومان وەكو هەموو نیعمەتەكانی دیكەی بەدیهێنەری مەزن، كەرەوزیش خۆش و بەسوودە،بۆیە بەكەم تەماشاكردنی كارێكی نەشیاوە.

من هەرگیز كاری واناكەم بەرامبەر ئەو خوایەی ئەم هەموو نیعمەتەی پێ بەخشیووم، شەرم دەكەم. وەلێ نایشتوانم كەرەوزی بخۆم.

چیم لەدەست دێت، ئیشتهای كەرەوز خواردنم نییە.

زمانم هەست بەخۆشی تامەكەی و لوتیشم هەست بە خۆشی بۆنەكەی ناكات...

بەلاّم من هاورِێیەکم هەیە مردووی کەرەوزە. ئای خوایە، ئەوە چ حەزێکی مەزنە بۆ کەرەوز! چ ئیشتهایەکە بۆ کەرەوز!

ئەو کەرەوزەی بارودۆخی گەدەی من تێکدەدات، هەر هەمان کەرەوزە بۆ ئەو وەکو کولیچە و چۆرەك بەلەزەتە!

ئەو کەرەوزەی من نە لە تامەکەی و نە لە بۆنەکەیدا خۆشیەك دەبینم، لای ئەو گوڵی مەجلیسی سەوزەکانە! سەرسورِهێنە، زۆر سەرسورهێنە!

ئێستا گەر من بلێم: " ئەدی باشە خواوەند بۆچی فاسۆلیای ئەوەندە خۆش بەدیهێناوە، کەچی کەرەوزی هەژاری هێندە ناخۆش دروست کردووە ؟ "

ئایا ئەوکات هاورێکەم کە کوشتەی کەرەوزە، نالێت:

" تۆ لەکوێوە دەزانی کەرەوز ناخۆشە برادەر ! فاسۆلیا چەندە خۆش و بەتام بێت، کەرەوزیش ئەوەندە نیعمەتێکی بەتامە".

ئەی ئایا نالێت:" ئەو ڤیتامینەی لە کەرەوزدا هەیە لە هیچ سەوزەیەکی دیکەدا نییە" ؟

ئیدی منیش لەوە تێدەگەم کە: " کەرەوز سەوزەیەکی ناخۆش نییە ! بەلاّم من خۆشیەکەی ئەو درك پێناکەم! وا هەست ناکەم هیچ نیعمەتێکی خودا ناخۆش بێت. "

# پیاوی ناو کەشتییەکە

ڕۆژێك لەناو کەشتیەکدا پیاوێکم بینی. پیاوەکە لە چاوی مندا هێندە ناشرین بوو کە -خودا بم بەخشێ- لەناخمەوە وتم: " خودا بۆچی ئەو پیاوەت ئەوەندە ناشرین ئافراندووە؟"، پاشان زۆر پەشیمان بوومەوە. داوامکرد لە پەروەردگارم لێم ببورێت لەبەرئەوەی بەچاوێکی کەم لە بەندەیەکیم ڕوانیبوو. زۆر بەکوڵ پاڕامەوە " خوایە گیان لێم خۆش بە!..."

....

پاش کەمێك ئافرەتێك لەگەڵ منداڵێکدا کە چۆرەکێکی بە دەستەوەبوو هاتنە تەنیشتی پیاوەکەوە دانیشتن. تومەس ئافەرتەکە ژنی ئەو پیاوەبوو، بۆ کڕینی چۆرەك بۆ منداڵەکەی چووبووە بەشی خوارەوەی کەشتیەکە.

کابرا هەرئەوەندە منداڵەکەی چاوپێکەوت، بزەیەکی شیرینی کرد. لەسەر ڕوخسارە گچکەکەی منداڵەکەش پێکەنینێکی چاوەڕواننەکراوی ناسك پرشنگی دایەوە.

پیاوەکە لێی پرسی : " کوڕەکەم چۆرەکت کڕی؟"

منداڵەکە بە نیشاندانی چۆرەکەکە وەڵامی باوکی دایەوە.



کابرا پێی وت : " کەمێکی لێبکەرەوە بامنیش تامی بکەم"
منداڵەکە هەموو چۆرەکەکەی درێژ کرد بەرەو باوکی.

لەبەرامبەر ئەمە پیاوەکە زۆر شانازی کرد، وتی " سەیری کوڕە مەردەکەی خۆمکە، هەموویم پێدەدات!".پاشان پیاوەکە منداڵەکەی خستە باوەشیەوە، منداڵەکە ئەوەندە بەتاسەوە باوەشی کرد بەباوکیدا و گوشی بەخۆیەوە کە دەتووت چەند ساڵ بوو یەکتریان نەبینیووە. باوك ماچی ڕومەتی بەرخۆلەکەی کرد، کوڕەکەشی بە لێشاوی ماچ وەڵامی باوکی شیرینی دایەوە. باوکی وتی: "دەی باپێشبڕکێیەکی ماچ بکەین !"



بەو جۆرە دەستیان کرد بەپێشبڕکێ: (کێ زووتر ماچی ئەوی دی دەکات).

هەندێ جار پیاوەکە دەیبردەوە، هەندێ جاری دیکە کوڕەکە...

کەشتیەکە نقومبوو لەژێر دەنگی ماچی ئەم کوڕ وباوکەدا...

دایکی منداڵەکە بەچاوە ئەسریناوییەکانیەوە لەم تابلۆ زیندووەی خۆشەویستی کوڕو باوکی دەڕوانی، منیش وەك هەموو سەرنشینانی دیکە، مەستی ئەم دیمەنە سەرسوڕهێنە بووبووم.

تەماشایەکی ئەوانم کردو بینم لەشوێنی پیاوە ناشیرینەکە تۆزێك پێش ئێستا، بەسۆزترین باوکی دنیا دانیشتووە. لەبەرئەوەی پێشتر لەناخمدا درووستبوو، بۆ جارێکی دیکە ناخم بەو ئاگری پەشیمانییە سوتایەوە.

وتم : " ئەی کردگاری جوانکار، بەندەکانت چەند جوان بەدی دەهێنیت! "

ئێستا ئیدی دەبێت دەستبەجێ لە لێکچوونی ڕوانینم بۆ پیاوەکە و حەزنەکردنم لە کەرەوز تێبگەیت. هەردووکیان تێڕوانینێکی کوێرانەبوون. لەبنەڕەتدا نە کەرەوز ناخۆشە، نە ئەو پیاوەش ناشیرین بوو.

کەرەوز دارای چەند ڤیتامینێکە کە لە سەوزەکانی دیکەدا نییە. دارای تامێکە کەخۆشترە لە زۆرێکی دیکە. پیاوەکەش

پێدەچێی کەسێکی بەڕواڵەت جوانخاس نەبێت وەلێ " پیاوێکی مەردبوو" لەچاوی کوڕەکەیدا جوانترین باوکی دنیا بوو.

پرسیت:" گوایە بۆچی خودا هەندێ کەس بەناشرینی دروست دەکات؟"، وانییە؟

کەم تازۆرێك وەڵامت دەستکەوت؟

کارسازی مەزن کەس بەناشرینی دروست ناکات. بەڵکو جوانی جیاواز جیاواز دەبەخشێت پێیان...

بەڵێ ڕاستیەکەی ئەمەیە. بەڵام ئێمە زۆرجار ڕاستیەکان درك پێ ناکەین. درك بەوەناکەین کە ئەو شتانە بە ناشیرینی دەیانبینین، ناشیرین نین بەڵکو پڕن لەجوانی جیاوازی هەمەجۆر...

## جوان و ناشیرینەکانی تەلەفیزیۆن

بەڵێ بۆمان جودا ناکرێتەوە ! چونکە نازانین وشەکانی جوان و ناشرین چیمان پێدەڵێن یاخود پێویستە چیمان پێ بڵێین. لە قوتابخانەکاندا واتای وشەی جوان و ناشرین هیچ نەبێ بەئەندازەی زانیاری " بوونی ئەندامی (سی) لە کۆئەندامی هەناسەی مێرووەکاندا"، ڕوون ناکرێتەوە...

بەزۆری وشەی (جوان) لە تەلەفیزیۆنەوە دەبیستین. "ئەم جوانە وایکرد، ئەو جوانەی دیکە وای نەکرد"

ئەم وشەیە و چەندینی دیکەی وەکو ئەمە لەسەر پەڕەی دنیای ئێمەدا دەنوسێت گوایە " کە دەڵێیت جوان دەبێت بەم جۆرە بێت".

ئەدی ناشیرین؟

ئێ دەبێ ناشیرین ئەوکەسانە بن کە لە تەلەفیزیۆندا بە جوان دانانرێن!

کەم تازۆر هەموومان دەگرێتەوە!!

مادەم بابەتەکە گەشتووەتە ئێرە، ئیدی بەئاسانی لێی دەرناچین.

تۆ لەسەرەتای تەمەنی لاویدایت، وەرە باپێکەوە ئاوەزمان بە بابەتەکەوە سەرقاڵ بکەین، بێزارمەبە...

## بۆکێ جوان ، بۆکێ ناشیرین
## بۆکێ ناشیرین ، بۆکێ جوانن

نیشتەجێکانی دارستانەکانی ئەفریقیا، یەکەمجار کە چاویان بە سپی پێستەکان کەوت وتبوویان: "ئەمانە چەند کەسانێکی ناشرینن"



بێگومان سپی پێستەکانیش لەلای خۆیانەوە ئەوانیان بە " ئەو پەڕی ناشیرین " لە قەڵەم دەدا.

باشە لە تۆ دەپرسم:

"سپی پێستەکان ناشیرینن یاخود ئەوانی دیکە ؟"

گەر دەتەوێ بەشێوەیەکی دادگەری وەڵام بدەیتەوە، پێویستە بڵێت " نە سپی پێستەکان ناشرینن، نە ئەفریقییەکان ناشرینن".

چونکە ئەفریقیەکان بە گوێرەی سپی پێستەکان، سپی پێستەکانیش بە گوێرەی ئەفریقیەکان ناشرینن.

لە دنیای مرۆڤەکاندا، جوان و ناشرین زۆربەی جار، وەها جیاوازیەك نیشان دەدات.

کەسێك بۆ کۆمەڵێك جوان بێت بۆ کۆمەڵێکی دیکە ناشرینە. کەسێکیش بۆ کۆمەڵێك ناشیرین بێت، بۆ کۆمەڵێکی دیکە جوانە...

دەزانم تۆ کەیفت بەبیستنی چیرۆك دێت، کەوایە گوێ ڕاگرە:

دەستەودائیرەی پاشا باسی مەجنونی عاشقیان بۆ کرد بوو: "ئەی پاشای گەورەم لەتاو عەشقەکەی خەریکە گیانی دەربچێت، داویەتیە بیابان.

هەر دەڵێت (لەیلا) و هیچ گۆیەکی دیکە لەزاری نایەتە دەرەوە. تەنانەت ئەو سەگانەشی لە مەملەکەتەکەی (لەیلا) وە دەهاتن دەیگرتن و ماچی دەکردن! "

سوڵتان کە گوێبیستی ئەمانەبوو تامەزرۆی ئەوە بوو کە جوانییەکەی (لەیل) ببینێت و بزانێت ئەوە چییە (مەجنونی) وێڵی دەشت ودەر کردووە. فەرمانی دا:

"بڕۆن لەیلا بهێنن، بزانین چ شاجوانێکە ئەمە!"

پیاوەکانی پاشا ڕۆشتن و (لەیل)یان دۆزیەوە، (مەجنون)یشیان لەهەمان کاتدا هێنا.

پاشا سەرەتا چاوێکی لەدۆخی پەرێشانی (مەجنون) کرد. پاشا ڕوی وەرچەرخاند و تەماشای (لەیل)ی کرد. ئەی خوایە چی دەبینێت، (لەیل)ەکەی (مەجنون) کچێکی وشك هەڵگەڕاو و

زەعیف بوو. لەگەڵ ئەمەشدا کەسێکی هێنـدە دڵگیرو جوانخـاس نەبوو. بۆیە پاشا سەری لەم کارە دەرنەدەکرد.

پاشا لە (مەجنون)ی پرسی:

" ئایا ئەو کچەی تۆی شێت و شەیدا کردووە ئەمەیە؟"

مەجنونیش سەرێکی هەڵبڕی و بەڕوی پاشـادا بزەیـەکی کـرد و بەم جۆرە وەڵامی دایەوە:

"ئاییی پاشا گەورەکـەم! بریـا بتتوانیایـە لـە چـاوی منیشـەوە سەیرێکی بکەی!"

بەڵێ، دەرئەنجامی ئەم چیرۆکە تێدەگەیت کە چەمکی جـوان و ناشــیرین لــە کەســێکەوە بــۆ کەســێکی دیکــە دەگۆڕێــت. ئــەو (لەیل)ەی پاشا لچی لێ هەڵکرچاند، مەجنون بۆی کەوتە بیابان...

ئــەو (لــەیل)ەی بــەلای پاشــاوە ناشــرین بــوو، بــۆ مــەجنون شاجوانی دنیا بوو...

ئێستا تۆ بڵێ بزانم، خودا (لەیلا)ی بەجوانی بەدیهێناوە یـاخود ناشرین؟

دەبێت باوەڕ بەسوڵتان بکەین یاخود بە مەجنون؟

من باوەڕ بە کەسیان ناکـەم. چـونکە (لـەیلا) هەرچـۆنێك بێـت، بەوەی پاشا کە بە ناشرینی زانی ناشرین نابێـت، یـاخود مـەجنون بە جوانی زانی جوان نابێت.

دەزانم سەرت لێ تێک چوو. گوایە (لەیلا) جوان بوو یان ناشرین؟

بڕیات بۆ نادرێت.

بەڵێ، ناتوانیت بڕیار بدەیت!

لەگەڵ ئەم هەموو پێوەرە گۆڕاوەی مرۆڤەکاندا، ناتوانیت بڕیار بدەیت کێ جوانە و کێ ناشرینە!

کەوایە تۆ پێویستت بە پێوەرێکە کە لە مرۆڤێکەوە بۆ مرۆڤێکی دیکە، لە چاوێکەوە بۆ چاوێکی دیکە، لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی دیکە نەگۆڕ بێت.

پێوەری جوانی ڕاستەقینە و ناشرینی ڕاستەقینە...

## جوان ئەوەیە لەلات بمێنێتەوە

پێدەچێت جلێکی جوان لەبەریدەکەین، ئێمە جوان پیشان بدات. بەڵام هەرگیز بەس نییە بۆ ئەوەی جوان ببین.

چونکە هەرکە جلەکەمان داکەند بمانەوێ و نەمانەوێ ئەو جوانییەشی جلەکە پێی دابووین دایدەکەنین و لەناو کەنتۆرەکەدا هەڵی دەواسین. کەواتە جوانی جل وبەرگ جوانییەکی کاتییە، هی ئێمە نییە.

بەلابردنی جل وبەرگەکە، جوانییەکەش نامێنێت...



پێدەچێت جلێکی ناشرینیش، ئێمە ناشرین پیشان بدات. بەڵام هەرگیز بەڕاستی ناشرینمان ناکات. بە گۆڕینی ئەو جلکە شوێنەواری ناشرینییەکەش لەسەر ڕوومان نامێنێت.

جەستەمان وەك جل و بەرگ وایە بۆ ئێمە. جل و بەرگێکی وا کە چ جوان بێت چ ناشرین، بێگومان ڕۆژێك دادێت کۆن دەبێت و لەژێر گڵدا بەجێی دەهێڵین...

ئەوانەی ئێمەیان کردووە بە ئێمە بریتین لە ژیری، گیان، ویژدان، دڵ، ئەندێشە، ئومێد، باوەڕ، ترس، دڵخۆشی و ئەوانی دیکە کە لەژێر پەردەی جەستەمانەوەن...

بەڵێ، هەروەك چۆن بەرگێکی جوان بەڕاستی مرۆڤ جوان ناکات، جەستەیەکیش کەلەڕوی دەرەوەدا جوان بێت کەسەکە بەڕاستی جوان ناکات.

جەستەیەکی ناشرینیش کەس بەڕاستی ناشرین ناکات...

هەروەها چ جوان بێت وچ ناشرین، هەموو کەسێك ڕۆژێك لەڕۆژان ماڵئاوای لەم دنیایە دەکات و لە دنیا دەردەچێت. کە دەریشچوو بەرگی جەستەکەی لە دوای خۆی بەجێ دەهێڵێت.

ئەوی لە گەڵیدا دەمێنێتەوە،

کارە چاك، یاخود خراپەکانییەتی،

دادپەروەری، یاخود ستەمکاریەکەیەتی،

سەخاوەتمەندی، یاخود ڕژدییەکەیەتی،

بەندایەتی یاخود یاخی بوونەکەیەتی،

ئیمان یاخود بێ باوەڕیەکەیەتی،

پاداشت یاخود تاوانەکانی یەتی!

واتە جوانیە ڕاستەقینەکانی یاخود ناشرینیە ڕاستەقینەکانییەتی...

ئیدی ئەوکاتە بەڕوونی دەبینرێت کێ جوانە و کێ ناشرینە...

نەك شەو دوای هەواڵەکان لەبەرنامەی تەلەفیزیۆنیەکاندا...



## ئەوەی بەڕوخسار تێبکەوێ ، هەڵدەخەڵەتێ !

پیاوێـك هــەبوو پێغەمبــەرمانی ﷺ زۆر زۆر خـۆش دەویســت. لەبیابانـدا ژیـانی بەسـەردەبرد. تۆزێـك ڕوخسـاری ناشـیرین بـوو. کاتێك دەهاتـە شـاری مەدینـە میـوەی جۆراو جۆری وەك دیـاری دەهێنا بۆ پێغەمبەرﷺ. حەزرەتیش لە بەرامبەریدا ئـەو شتانەی کابرا پێویستی پێی بوو دەیدایە و بەوەش دڵی خۆش دەکرد.

ڕۆژێك لەناو بازاڕدا ئەوی بینی. بەئەسپایی لێی نزیك بـووەوە و لە دواوە توند چاوی گرت، فەرمووی:

"کێ دەیەوێت ئەم بەندەیە بکڕێت! "،

کابرا بەدەنگی پیرۆزیدا ناسیەوە کە ئەوەی چاوەکانی گرتووە سەرداری مرۆڤایەتییە.

وتی:

"ئەی نێردراوی خودا، خەڵك چی بکات لە بەندەیەکی ناشرینی وەك من! بە فرۆشتنم هیچ سودێك ناکەیت! "

پێغەمبەری میهرەبان بۆ هەموو کەسێك لە وەڵامدا، فەرمووی: "پێدەچێت کەسانێك بەڕوخسار هەڵبخەڵەتێن و پارەی زۆرت پێ نەدەن، بەڵام نرخت لای خودا زۆر گەورەیە! " بەمجۆرە گرنگی ئەوی نیشاندا و دڵی خۆش کرد.

# بۆچی خودا هەندێك بە کەمئەندامی دروست دەکات یاخود ناتەندروستیان دەکات ؟



هاوڕێیـەکم هـەبوو پێشـتر زۆر زۆر یـەکترمان دەبینـی. پـاش ئـەوەی هـەر یەکـەمان کەوتینـە شـارێکەوە ئیـدی وای لیهـات زۆر دەگمـەن چـاومان پێـك بکـەوێت. کاتێـك پرسـارەکەت لێ کـردم دەستبەجێ ئەوم وەبیرهاتەوە... زەنگم بۆی لێدا، تۆزێك قسەمان کرد، حاڵی باش بوو. لە کۆمپانیایەکی تەلەفۆنیدا کاری دەکرد.

دەمزانـی ژنـی هێنـاوە، بـەم دوایانـەش بیسـتبووم کـوڕێکی بووبوو.

لە تەلەفۆنەکەدا ووتی "کوڕەکەم لـەناو ماڵەکـەدا هێنـدە خێـرا ڕادەکات، تەنانەت منیش بۆم ناگیرێتەوە" هـەردووکمان بەمـە زۆر پێکەنین!

دەزانی بۆچی ئەوم وەبیر هاتەوە؟ چونکە بەر لە پێنج ساڵ توشی ڕوداوێکی ئۆتۆمۆبێل بوو و قاچی ڕاستیان لە ئەژنۆوە بڕییەوە...

سەرەتا زۆر ئەستەم بوو بۆی. لەگەڵ ئەوەی ئیمانێکی پتەوی دامەزراوی بە خواد هەبوو، کار گەشتە ئەوەی بڵێ: " بۆچی من؟! ئاخر بۆچی دەبێت من ئاوا بەڵایەکم بەسەردا بێت؟"

ئیدی ئەم ناڕەزاییانەی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیادی کرد، هۆکارەکەشی بریتی بوو لە کەسەکانی چواردەوری.

خزمەکان و دوو سێ هاوڕێی کەلەپوتی هەر دەهاتن وبرینەکەیان بۆ قوڵتر دەکرد:

وای وای، هەژارە بەو لاوێتیەوە کەمئەندام بووە! ئای ئەمە کەی قەدەرە هەیەتی؟".

من چیتر خۆمم پێ ڕانەگیرا. بەڵام وادیاربوو گەر ڕووبەڕوو گفتوگۆ بکەین گوێ بۆ قسەکانم ڕاناگرێت.

بڕیارمدا نامەیەکی بۆ بنوسم، هێشتاش ئەو نامەیەم پاراستووە. وەڵامی پرسیارەکەی تۆ بە دووردرێژی لەو نامەیەدا دابووەوە. بڕێك درێژە دەکێشێت، بەڵام تکایە مەڵێ بێزار بووم!

ئەم پرسیارەی کردووتە گەلێك بایەخدار و گرنگە، کەوایە وەڵامەکەش دەبێت بەها گران بێت...



## خۆشەویستم (م)

بێگومان منیش وەك هەر کەسێکی دیکە بەم ڕوداوە دڵ تەنگ بووم. ئازارم چەشت و نزام بۆ کردی، داوای ئارامگری و چاکەم لە خواوەند بۆکردی..

بەڵام هەر لەسەرەتاوە پێت بڵێم، وانەزانیت منیش وەك ئەو گەمژانەی چواردەورت " ئاخ و داخ " هەڵکێشم بەو جۆرەی ئەوان بەزەییم پێتدا بێتەوە!

نەخێر شتی واناکەم، ئەگەر چاوەڕێی شتی وام لێدەکەیت هەرگیز ئەم نامەیە مەخوێنەرەوە.

هەڵبەت من هێندەی تۆ نازانم لەدەستدانی قاچێك و کەمئەندام بوون چ واتایەکی هەیە.

وەلێ گەربڵێیت "لەبەرچی ئەم بەڵایە لکا بە منەوە؟ ئەم هەموو مرۆڤە لەدنیادان، تەنها نۆبەی من هاتبوو؟ من چ سوچ و تاوانێکم هەبوو کە خوا ئەمەی بەسەر هێنام؟". لەهەر بارێکادا هەیت با ببیت، مافت پێ نادەم!

ئەگەر ئەو ڕۆژانەی دەنگم نەدەکرد تەنیا لەبەرئەوەبوو کە دەمزانی ئەو پورێ بێکارانەی لە چواردەوری سیستەمەکەت کۆدەبوونەوە و دەیانکێشا بە ئەژنۆی خۆیاندا " وای وای ڕۆڵە

بەدبەختەکەم" لە وتەکانم تێناگەن. ئەدی هەستت نەکردبوو تەنانەت دایکیشت چەند بێزاربوو لە وتەکانیان و ئەو دۆخەی تۆیان بۆ ئاراستە دەکرد.

ئازیزەکەم " م" تکایە گوێ بۆ قسەکانم ڕابگرە و نامەکە بەووردی بخوێنەرەوە. گەر بێتوو بەردەوام بەهەڵە ڕووبەڕوی دۆخەکە ببیتەوە پێدەچێت چیتر ڕزگار بوونت لەژێر عەرەبانە وەرچەرخاوەکەتەوە ئەستەم بێت.

"لەکاتێکدا ئاسمان هێندە بەرینە و خۆریش بەو ئەندازەیە درەخشانە، نابێت ڕازی بیت بەوەی پەڵە هەورێکی تاریک بەدرێژای تەمەنت تروسکایت لێ ببڕێت"



## بەرگدروو و مۆدێلەکەی

سەردەمانێك بەرگ دروویەك هەبوو، ئێجگار بەتوانا و دەست ڕەنگین بوو. ناوبانگی بەرگدروێتی، دەست ڕەنگینی و شێوازی ئەو جلکانەی دەیدورین بە هەموو جیهاندا بڵاو بووبووەوە.

ئەم وەستا لێهاتووە بە مەبەستی تاقیکردنەوەی ئەو بەرگانەی دەیدورین پیاوێکی هەژاری بەکرێ گرت و بۆ ئەو مەبەستە پارەی دەدایێ.



یەك بە یەك جلەكانی لەبەر كابرا دەكرد و تەماشای چۆنێتی وەستان و ڕێك و پێكییەكەی دەكرد. بەئارەزووی خۆی ڕاست و چەپی دەبڕی، كورتی دەكردەوە و دەیدووری.

دەرئەنجام ڕۆژێك كابرای هەژار _ ئیدی نازانین لەبەرئەوەبوو ڕۆژانی نەداری بیر چووبۆوە یاخود چی_ بە بەرگدرووەكەی ووت:

" ئەریێ تۆ بۆچی بەردەوام لەم جلەی كردۆتە بەرم دەبڕیت و دەیدورێتەوە؟"

وەستای خاوەن لێهاتووی چەندین ساڵە وەڵامی ئەو كابرایەی كە بۆ كاری تاقیكردنەوەی مۆدێلەكانی بەپارەیەك گرتبووی بەم جۆرەی دایەوە:

" تۆ چ مافێکت هەیە تاکو بەم جۆرە لەگەڵم دەدوێیت! ئەو جلانەی لەبەریان دەکەیت خۆ هی تۆ نین! بەڵکو بۆ مەبەستێکی تایبەتی من ئەوانەم لەبەرکردووی.

ئێستاش لەبەر کۆمەڵە هۆکارێك کە تۆ نایان زانیت کورت و درێژی دەکەمەوە، دەیبڕم و دەیدورمەوە. هەرچۆنێك خۆم بمەوێت وای لێدەکەم.

چیت بەسەر هاتووە وا ڕۆژانی نەداریت بیرچووەتەوە لە بری سوپاسگوزاری ڕەخنەم لێدەگریت !"

بەم جۆرە چیرۆکەکەمان کۆتای هات.

ئەم چیرۆکە یەکێکە لە چیرۆکە پڕ پەند و ئامۆژگاریەکان. بۆیە من زۆرم خۆشدەوێت. لەو کاتەی لە پەرتوکێکدا خوێندمەوە هەرگیز لەبیرم نەکردوە. ماوەماوە لە ئاوەزی خۆمدا دەیلێمەوە، ماوەماوە سەر لەنوێ دەیخوێنمەوە...

بەتایبەتی لەکاتی پێشڕەوی کردن لە ڕێگاکانی ژیاندا کە کۆمەڵێك ڕوداوی زویرکەرم بۆ هاتۆتەپێش، ئەم چیرۆکە بچوکە و ئەو وانەی تێدایە بوونەتە مەشخەڵێکی ڕووناکی ڕزگارکەر بۆم.

ئێستا تۆ بیرێك لە جەستەی خۆت بکەرەوە.

کاتێك چاوت بەدنیا هەڵهێنا. بە بەرگی (جەستەی مرۆڤانەوە) لەدایك بووی. زۆر باش دەزانیت بۆ دەستخستنی ئەمە هیچ پارەیەکت نەداوە.

خواوەند تۆی لەنەبونەوە هێنایە بوون. نەیکردی بە مادەیەکی بێگیانی وەك بەرد ودار.

هەروەها نەیشکردی بەرووەکێکی وەك مەعدەنوس، شێلم و درەختی هەرمێ...

هەروەها نەشیکردی بە ورچی جەمسەرەکان و کرمی بەرو...

کەوایە سەردەمانێك نە تۆ هەبوویت نە ئەوانیش.

بەدیهێنانی تۆ وەك مرۆڤ یاخود هەریەك لەوانەی ڕیزمان کردن بۆ خودا تەوفیرێکی نییە.

تەنها (ویستی) هەبوو. وە خودا تۆی ویست.

لەسەر جوانترین شێواز دروستی کردی.

ئەدی بۆبیرێك لەو ڕۆژانە ناکەیتەوە کە هیچ شتێك نەبووی، یاخود ئەو ڕۆژانەی وەك پارچە گۆشتێکی فڕێدراو لە سکی دایکدا بوویت و لە هیچ شتێك نەدەچووی؟

ئایا ئێستا لەبیرت چۆتەوە کە پەروەرێنت لە کوێوە گەیاندیتە کوێ و لە چ دۆخێکەوە گۆڕایتی بۆ چ دۆخێك، وا لەبەر

ناڕەحەتییەکی لەو جۆرە ناڕەزاییی دەردەبڕێت و دەڵێت :" بۆچی من! بۆ دەبێت ئەم بەڵایە بەسەر مندا بێت؟".

ئایا هەموو ئەم بەخشش و خزمەتانەی بەدیهێنەر، لەبەر ئەوەی ڕوداوێکت بەسەر هات، وەلا دەنێیت!

بەهۆی ئەوەی کە ئەو یەکێك لەقاچەکانی پێی بەخشیبووی لێی سەندیتەوە، بەو زمانەی ئەو پێی داویت، بەو ژیریەی ئەو پێی داویت، بەو ژیانەی ئەو پێی داویت،دژی دەوەستیتەوە ؟

پێویستە ئارام بگریت! گەر ئەمڕۆ ئارامبگریت بێگومان سبەینێ سوپاسگوزار دەبیت...

(م)، ئەی هاوڕێ خۆشەویستەکەم!

کاتێك لەدایك بووی بەجەستەی مرۆڤەوە لەدایك بووی نەك بە پێستەی بەرخۆلەیەکەوە،

ئای ئەگەر دەست بدات ئەو جلە دادەکەنیت؟

ئایا بوون بەمرۆڤێك کە قاچێکی نەبێت هەڵدەبژێریت یاخود ، بوون بەپشیلەیەك کە چوار دانە قاچی ساغی هەیە؟

گوێم لێیە دەڵێت :" چییە؟ گاڵتەم لەگەڵ دەکەیت؟".

لەگەڵ ئەوەشدا بیرت نەچێت کلکێکی بەسودیشت دەدرێتێ..

وەلێ بۆ نانی نیوەڕۆ دۆڵمەی گەلامێو لەبیرکە! ئەگەر مشکە تۆپیوێکیشت دەستکەوێ نۆشت بێ. هەڵی بگرە و بینێ بەسەرتەوە و سوپاسی لەسەر بکە!"

ئەی ئەگەر چاوەکانت نابینا بوونایە؟

دەستەکانت لەکار بکاوتایە...

گوێچکەکانت کەڕ بوونایە...

مرۆڤێتیەکەت دەگۆڕییەوە؟...

هەلومەرجەکان هەر چۆنێك هەن بابن، هیچ کەسێك دەست بەرداری مرۆڤێتی خۆی نابێت و ببێت بە گیانداریکی دیکە، وانییە؟

دۆستەکەم، واتێنەگەیت بە وەبیرهێنانەوەی ئازاری مردن هەوڵدەدەم ڕازیت کەم بە ناڕەحەتی نەخۆشیەك. واتەپێت نالێم خراپترین لەبەرچاو بگرە و لەسەر خراپ سوپاسگوزاربە.

بەڵکو هەوڵدەدەم ئەوەت تێبگەیەنم کە ئەگەر چی قاچێکت لەدەست داوە بەلام ئەوانەی هێشتا لەدەستتدا ماون چەندە بەنرخن!.

ئەگەر نرخ و بەهای ئەوانە نەزانیت، بێگومانبە لەوەی گەر هێندەی یاریزانانی ڕاکردنیش لەش ساغ بیت، هێشتا هەر دڵخۆش نابیت...

## مزگێنی نەبڕاوە بۆ تۆ!

ئەگەر ئێمەی ئادەمیزاد هەتا سەر لەم دنیایەدا بژیاینایە، ئەوکات لەدەستدانی لاقێکی تۆ بەلا و نەهامەتیەکی مەزن دەبوو. ئیدی منیش وەك پیرەژن و بێکارەکانی چواردەوری جێگاکەت بە هاوار و فریاد و (ئاخ و ئۆف)کردن هەتا ڕادەی توانستم بەزەیم پێدادەهاتەوە.

بەڵام خۆت دەزانیت ژیانی ئەم دنیایە ژیانێکی نەبڕاوە و جاویدانی نییە. بەڵکو ژیانی جاویدانی ئەوەیە کە لە دواڕۆژدا نۆبەی دێت و چاوەڕوانمانە.

ڕۆژێك دێت هەریەکێك لە ئێمە لە دنیا دەردەچین، (گیان)مان جەستە گەنج یاخود پیرەکانمان _خۆ نازانین کامیانە!_ بەجێدەهێڵێت. ئیدی خۆشەویسترین کەسەکانمان بە وێنەی دەنکە تۆوێك دەمانتێژن...

لەڕۆژی پەسڵانی وەعدەدراوی خواییدا و ئەو ساتەی بەهاری تەمەن دووبارە دێتەوە، ئێمە دووبارە زیندوو دەکرێینەوە و دەنێردرێینەوە بۆ نیشتمانی خۆمان...

تەنیا ئەوەندە بزانە کە قاچی چەپی تۆ هەندێك پێش خۆت کۆچی کردووە...

وەلێ هیچ دوو دڵ مەبەو خەیاڵت تەخت بێت! لەژیانی ئەو دنیاتدا هەر دوو قاچت ساغ و سەلیم دەبێت.

هەمان مزگێنی بۆ ئەوانەی نابینایشن هەیە. ئەوان لەبەهەشتدا چاویان باشتر لە چاوساغەکانی دنیا دەبینێت، ئەویش بۆ هەتاهەتایە.

خواوەندی میهرەبان بۆ ئەو بڕوادارانەی لە دنیادا نەهامەتی جۆراوجۆر دەچێژن پاداشت و سوپرایزی تایبەتی ئامادەکردووە.

دەمەوێت نامەکەم کۆتای بهێنم بە دوو فەرموودەی پیرۆزی پێغەمبەری نازدارﷺ، هیوادارم نووسینەکانم کەمێك لە ئازارەکانتی کەم کردبێتەوە...

بەنیازی دیدار...

(( ئەو کەسانەی لەدنیادا ئەندامەکانی جەستەیان ساغ و سەلامەتە، کاتێك لەڕۆژی دوایدا ئەوهەموو پاداشتەی

بەکەمئەندامی ئارامگر دەدرێت دەبینن، هیوا دەخوازن کەلەدنیادا بە ئامێرگەلی تیژ جەستەیان پارچەپارچە بکرایە))!! (ترمزی).

((خوای گەورە لە فەرمودەیەکی قودسیدا دەفەرموێت : گەر دوو ئەندامە خۆشەویستەکە (دوو چاوەکە) لەبەندەیەکم بسەنمەوە، ئەویش لەبەرامبەردا ئارامبگرێت، ئەوا لەبری ئەو دوو چاوە بەهەشتی پێدەدەم)). (بخاری) .



## ئافرەتە بوراوەکە

لەسەردەمی بەختەوەریدا (سەردەمی پێغەمبەرﷺ و هاوەڵانی) ئافرەتێك هەبوو نەخۆشی بورانەوەی لەگەڵدابوو. هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و داوایەکی لێکرد:

((ئەی پێغەمبەری خودا من نەخۆشی بورانەوەم هەیە، دوعام بۆ بکەن بەڵکو چاك ببمەوە..))

سەردارمان بەئافرەتەکەی فەرموو:

((ئەگەر پێت خۆشە دوعات بۆدەکەم و ڕزگارت دەبێت لەنەخۆشیەکەت. ئەگەریش پێت خۆشە ئارامبگرە و بەهەشت بەدەست بهێنە لەبەرامبەریدا!!))

ئافرەتە پیرەکەش وەڵامێکی دایەوە کە شیاوی ئافرەتانی سەردەمی بەختەوەری بێت. وتی:

((ئەی نێردراوی خودا! مادەم پاداشتی ئارامگری هێندە گەورەیە کە دەڵێیت، ئەوا بڕیارمدا ئارامبگرم. بەڵام کاتێك نەخۆشیەکەم بۆدێت بێ ئاگادەبم و جلوبەرگی بەرم دادەکەنم، دوعام بۆ بکەن تاکو پۆشاکەکانم لانەبەم.))

پێغەمبەری خۆشەویستیش ﷺ بەو جۆرە نزای بۆکرد...

بێگومان خواوەند هەمیشە نزاکانی ئەوی گیرا دەکرد...

# پاش مردن، خودا چۆن زیندوومان دەکاتەوە؟



خـوای گـەورە دەفـەرموێت" جـا بڕوانـە بـۆ نیشـانەو قـازانجی ڕەحمەتی خوا چـۆن زەوی بـەو بارانـە زینـدوو ئەکاتـەوەو پاشـان وشك بوونەوەو مردنی. بەڕاستی ئەو خوایـە کـەوا زەوی بـەوجۆرە زیندوو ئەکاتەوە، ئەو خوایە کە مردووان زینـدوو ئەکاتـەوەو، ئـەو خوایە دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکا ئەشکێ" الروم: ٥٠.

لەسەردەمی بەختەوەریدا ڕۆژێك یەکێك لە هاوەڵـە بـەڕێزەکانی پێغەمبەر هەمان پرسیاری تۆی لە خۆشەویستمان کرد:

"ئەی پێغەمبەری خودا! خودا چۆن هـەموو ئـادەمیزاد زینـدوو دەکاتەوە. ئایا نمونەی ئەمە هەیە؟"

پێشەوای ئازیزمان فەرمووی :

" ئایا هەرگیز تۆ ڕێت نەکەوتۆتە هەواری ژیانی قەبیلەیەك، کە لە وەرزێکدا وشك دەبێت و پاشان هەموو لایەك تەواو سەوز دەبێت؟"

ئەوەی کە پرسیارەکەی کرد، وتی:

"بێگومان ڕێم کەتووە، ئەی پێغەمبەری خودا".

خۆشەویستیش لە بەرامبەریدا فەرمووی:

"ئەمە بەڵگەی دووبارە زیندووکردنەوەیە لەلایەن خوداوە، بەڵێ خودا بەوجۆرە مرۆڤەکان زیندوو دەکاتەوە ! ".

## چیتر وەرزی بەهارە

هەرچەند هەفتەیەك بەر لە ئێستا پەلی درەختەکان وشك و ڕووت بوون.

بەوێنەی پیرە ئەسکەلەکان، بە مات و مەلولی لە هەورە ڕەساسییەکانی زستانیان دەڕوانی.

پیرە قەلەڕەشە بێ غەمەکان لەسەر پەلەکانیان دەنیشتنەوە..

ئەو باخچە بێ سەدا و ڕەنگ پەرپیوەی کە هەموو قوشبنێکی ڕەنگی مەزارێکی تاریکی لێی نیشتبوو...

نەگەڵایەك، نەگوڵێك، نە میوەیەك...

نە جریوەی چۆلەکەیەك، نە خشەی مێروولەیەك...

نه ئەسپایی ڕاوەشانی باڵی پەپولەیەك...

هەرچیەك ڕویدابێت، لە ماوەی چەند هەفتەیەكدا ڕووی داوە !

سەرەتای بەهار دار هەڵوژەیەكم بینی.

سەرەتاپا بەگوڵی سپی ڕازابووەوە. بۆناو پەلـەڕەق و تەقـەكان چ نەش و نمایەك، چ دڵخۆشیەك، چ ژیانێك تەشریفی هێنابوو...

لەبەر خۆمەوە وتم " دار هەڵوژە، دووبارە زیندوو بووەوە ".

پاشـان دار قۆخێـك، لەبـەرە بـەیانێكی بێگـەردی فێنكـدا، پۆشـاكێكی پەمـەیی كرایـە بـەری، مـرۆڤ بـەبینینی ژیانـەوەی دەهاتەوە بیر...

لەبەر خۆمەوە وتم " دار قۆخ، دووبارە زیندووبوەوەوە "

لەقـەد پاڵەكانـدا چـیمەن و لـەناو باخچـەكاندا ملیۆنـەها گـوڵ سەریان دەرهێنا. گوڵی نێو ئینجانەكان و مێشهەنگی نێو پورەكان بەخەبەر هاتنەوە.

سەرزەمینی وشك و مردوو دووبارە ژیایەوە.

بۆم دەركەوت چیتر وەرزی بەهارە !

هەروەها بۆ وەڵام دانەوەی پرسـیارەكەی تـۆ لـەم كاتـە باشـتر نابێتەوە.

چونكە هەموو وەرزێكی بەهار بەدیهێنـەری مـەزنمان، ملیارەهـا نمونەی گچكەی زیندووبوونەوەی دوای مردنمان نیشان دەدات.

تـەقینی هـەر دەنکـە تۆوێـك، گـوڵگرتنی هـەر پـەلێکی وشـك، پشکوتنی هەر گوڵێك...

وەڵامی پرسیارەکەی تۆدەدەنەوە:

" بەڵێ، بەم جۆرە زیندوو دەبیتەوە! "

خوای باڵا دەسـتی توانـا بـەو جـۆرە زیـدووت دەکاتـەوە! بـەو ئاسانییە، بەو خێراییە!

خوای گەورە دەفەرموێت : "خوا ئەو خوایە زیندوو دەرئەکا لە مردوو و مردوو دەرئەکا لە زیندوو و زەوی ئەژێنێتەوە پاش مردنی و ئێوەیش هەر بەو جۆرە لە گۆڕ دەرئەکرێن و زیندوو ئەکرێنەوە.

" الروم: ٥٠

## کامیان ئاسان ترە ؟

بەڕاستی کامیان ئاسانترە؟ ئەنجامدانی کارێك بـۆ یەکـەم جـار یاخود هەمان کار بۆ جاری دووەم؟

بۆ نمونە ئەگەر تـۆ ئـەو داڕشـتەی بـۆ مامۆسـتات نوسـیبوو ون بکەی یاخود چایەکی بەسەردا بڕێژی ، ئایا نوسـینەوەی هێنـدەی جاری یەکەم قورس دەبوو؟

بێگومان نەخێر!

چونکە تاڕادەیەک هەمان ڕستەکانی پێشتر دێتەوە یاد و پێکهێنانی ئەو ڕستانەش جارێکی دی هێندەی یەکەم جار قورس نەدەبوو.

نیگار کێشێک نیگارێکی کێشا، پاشان لەڕوداوێکدا سوتا و بووبە خۆڵەمێش. ئەگەر نیگارکێش بڕیایدا دووبارە نیگارەکە بکێشێتەوە و وتی:" من دووبارە ئەو تابلۆیە دروست دەکەمەوە!" ئیدی کەس ناتوانێ پێی بڵێت:" نەخێر بۆت دروست ناکرێتەوە، لەکوێوە دروستی دەکەیتەوە؟ تابلۆکە بووبە خۆڵەمێش و بابردی..."

چونکە کەسێک یەکەمجار بتوانێت دروستی بکات، جاری دووەم زۆر ئاسان بۆی دەکرێت!

ئافرێنی یەکتا جارێک ئێمەی لە نەبوونەوە هێنایە بوون. جەستەمان لە ئاو، هەوا، گڵ، ڕووەکەکان، هەموو خۆراکەماددە زیندوو و بێگیانەکان کە دەیخۆن، گەردیلە بەگەردیلە و خانە بەخانە کۆی کردوونەتەوە و ئەم ژیانەی ئێستای پێداوین.

بێگومان دەستەواژەیەک بەناوی (ئاسان) یاخود (قورس) بۆ خواوەند بوونی نییە. وەلێ لەپێناوی باشتر تێگەیشتن لە زیندووبوونەوەی دوای مردن دەتوانین بڵێین:

"ئەو خواوەندەی جارێك ئێمەی لە نەبوونەوە هێناوەتـە بـوون، گەر بیەوێت بێگومان دوای مردنیش دووبارە زیندومان دەکاتـەوە. ئەمەش بۆ توانستی ڕەهای ئەو لە بەدیهێنانی جاری یەکەم گەلێك ئاسانترە."

بیر لە مرۆڤی دوو-سێ سەدە بەر لە ئێستا بکـەرەوە...ئێستا کەسـیان نـەماون. هـەموویان بـوون بـە خـۆڵ، گەردیلـەکانی جەستەیان تێکەڵی پێکهاتەی زەوی بووە...



ڕۆژێـك دێـت، وەك هـەموو زینـدەوەرێکی دیکـە، کاتێـك دێینـە دنیـاوە و پێیـدا تێدەپـەڕین، هـەموو ئـەو خانـە و گەردیلانـەی جەستەمان پێك دێنن گەرچی تێکەڵی خاك، ئاو و هەوا بووبێت...

گەرچی چووبنە ناو لەشی ڕووەکی هەمەجۆر و گیانداری جیاوازەوە گەرچی بە هەرچوارلای گۆی زەویدا بڵاو بێتەوە...

ئەو بەدیهێنەرەی سەرەتا لە چەندین شوێنی جیاوازەوە کۆی کردینەوە و بوونی پێبەخشین، دووبارە بەدیمان دەهێنێتەوە!

هەروەك چۆن هەزارەها گوڵی مردوو لەبەهاردا دەژێنێتەوە...

هەروەك چۆن دووبارە گوڵ، گەڵا و میوە دەداتەوە بە ملیارەها پەلی وشك بووی ملیارەها درەختی وشك بوو...

هەروەك تۆوە نوستووەکانی ژێر زەوی کەلە ڕۆژێکی بەهاردا و لە پڕ بەرگی ژیان دەکرێت بەبەریدا...

# ئێسکە پوکاوەکان

ساڵانی سەرەتای ئیسلام بوو. دەستەیەك لەبێباوەڕە هەرە دڕندەکان کۆبونەوە و وتووێژیان کرد. لەناویاندا (ئوبەی کوڕی خەلەف) هەبوو کە زۆرترین جار هەوڵی بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەری ﷺ دەدا.

وتی: "محمد دەڵێت بێگومان خودا مردووەکان زیندوو دەکاتەوە. سوێند بە (لات) و (عوزا) دەبێت بچمەلای و مناقەشەی لەگەڵ بکەم هەتا لێی دەبەمەوە! ئێسقانێکی پوکاوەی بە دەستەوە گرت و چووە لای پێغەمبەری نازدارﷺ.

وتی: " ئەی محمد! تۆ بانگەشە بۆ ئەوە دەکەیت کە خواکەت دوای ڕزانی ئەو ئێسقانە دووبارە دروستی دەکاتەوە، وایە؟"

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:" بەڵێ من وادەڵێم!"

ئوبەیە دەموچاوی لێ گرژ کردەوە و وتی:" کەوایە تۆ بڕوات وایە پاش ڕزان و پوکانەوە خوا ئەم ئێسقانە دیسان دروست دەکاتەوە، ها!"

ئێسقانەکەی لەناو دەستیدا وردکرد و تۆزەکەی کرد بەڕوخساری پیرۆزی پێغەمبەردا و وتی:

"ئەی محمد! ئەمە دوای وردبوونی کێ دەتوانێت پێکی بهێنێتەوە؟ ئایا، ئێمە دوای ئەوەی مردین و وەك ئەم ئێسقانە

ڕزاین و بووین بە خۆڵ دووبارە زیندوو دەبینەوە؟ کەئێمە وامان لێهات، ئیدی ئەوە کێیە دەتوانێت زیندومان بکاتەوە؟"

پێغەمبەری خۆشەویستمان فەرمووی:

**" بەڵێ، خودا تۆ دەمرێنێت! پاشان زیندووت دەکاتەوە، دواتریش دەتخاتە نێو دۆزەخەوە!".**

لە ئەنجامی ئەمە پەروەردگار ئەم ئایەتە پیرۆزەی ناردە خوارەوە: "ئایا ئادەمزاد نازانێ ئێمە ئەومان لە تۆمێ دروست کردووە لە پیاوەوە ئەگاتە منداڵدانی ئافرەت، کەچی کە پێگەیشت ئەبێ بە دوژمنێکی دیار و ئاشکرا؟ ¤ کابرای خوانەناس ئێسقانێکی ڕزیوی بە نموونە بۆ هێنایەوە کە گوایە مردوو زیندوو ناکرێتەوە و دروستکردنی خۆی لەیادچوو کە چۆن لە دڵۆپێ ئاو دروستمان کردووە. وتی: کێ ئێسقانی ڕزیو زیندوو ئەکاتەوە؟ مەبەستی ئەوەبوو کەس ناتوانێ زیندووی بکاتەوە. ¤ تۆیش، ئەی موحەممەد، لە وەڵامیا بڵێ: ئەو کەسە زیندووی ئەکاتەوە کە یەکەمجار دروستی کردووە کە خوایەو ئاگای لە هەموو شتێکیش هەیەو، ئەزانێ مرۆڤ کە مرد چی لێدێو، کە ڕزیی خۆڵەکەی ئەبێ بەچیو ئەکەوێتە کوێو چۆن کۆئەکرێتەوەو ئەخرێتەوە پاڵ یەک و، بنیادەمەکەی جارانی لێ دروست ئەکرێتەوە." یس: ٧٧ – ٧٩

# کاتێك فوو دەکرێت بە ﴿صور﴾دا...

هەست دەکەم بابەتێك ئاوەزتی داگیر کردبێت و گیرۆدەی کردبێت. لەڕاستیشدا گیرۆدەی نەکردووە وەلێ خۆت حەز دەکەیت باشتر لە بابەتەکانت تێبگەیت و داوای نمونەیەك لە من دەکەیت ـ کە هەر بە بیستنی بڵێت،" ئاه ئەوە ئێستا تێگەیشتم"

بەرلەوەی ئەم بابەتەت بۆ باسبکەم خودی خۆم کتێبێکم خوێندەوە چەند نمونەیەکی تێدابوو بە خوێندنەوەی هەر یەکەیان، هەموو خاوەن ژیریەك وا لێدەکات بڵێت "ئاه، ئەوە ئێستا تێگەشتم"...

هەروەك دەزانیت فریشتەی پایەبەرزی یەزدان ئیسرافیل کاتێك فویکرد بە (صور) دا ڕۆژی پەسڵان دەست پێدەکات.

خوای گەورە دەفەرموێت : "جا کاتێ کە یەك فوو پیاکردن فووکرا بە (صوور)دا. ¤ زەویو شاخەکانیش لە جێی خۆیان هەڵگیران و بەیەك جار دران بەیەکا، ¤ لەو ڕۆژەدا ئەوەی ڕووئەدا، ڕووئەداو، ڕۆژی قیامەت بەرپا ئەبێ. ¤ ئاسمانیش لەت لەت ئەبێ. ئاسمان لەو ڕۆژەدا ئەم ئاسمانەی ئێستا نییە، ئاسمانێکی لاوازو بێهێزە." الحاقة: ١٣ – ١٦.

کاتێك فووی دووەمی پێدا دەکات، هەموو مردووەکان زیندوودەبنەوە. ئەم کارە لە ساتێکدا ڕوودەدات.

هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: "فویش دەكرێت بە صوردا ئیدی ئەوان لە قەبرەكانیان دەردەچن و بە هەڵە داوان دەچن بۆلای خوای خۆیان بۆ مەیدانی لێپرسینەوە." یس: ٥١

لەوە تێگەشتین كە چۆن لەو وەرزە گەورەی بەهاردا هەموو جەستەكان دانە بەدانە بەدی دەهێنرێنەوە. ئەوەندەی بزانم نمونەی ژیانەوەی سەر زەوی مردوو و وشك و ڕەق لە وەرزی بەهاردا هەموو ساڵێك، كە هەم لە قورئان و هەم لە فەرموودەی پێغەمبەردا هاتبوو مێشك و دڵی دڵنیا كردی...

ئەوەی هێشتا نەزانراوە لات ئەمەیە: ئایا هەموو مرۆڤەكان لە سەردەمی باوكە (ئادەم)ەوە، هەتا ڕۆژی دوایی كە دەمرن و جەستەكانیان دەخرێنە ژێر خاكەوە چۆن لە ساتێكدا دەست بەجێ گیانی هەر ئادەمییەك دەچێتە ناو جەستەكەی خۆی...

واتە كاتێك فوو دەكرێت بە صوردا چۆن ئەم كارە لە تەنیا ساتێكدا ڕودەدات...

سوپایەك هەبوو لە چەند ملیۆن سەربازێك پێك هاتبوو. پاش ئەوەی بەدرێژای ڕۆژگار سەربازەكان سەرقاڵی مەشق و ڕاهێنان بوون، دواجار فەرماندە فووی كرد بە (بوق)ەكەیدا و فەرمانی پشودانی دەركرد.



هـەموو سـەربازەكان سەربەسـت بـوون و هەريـەكێك بەلايەكـدا ڕێگەی گرتەبەر. يەكێك بۆ پشوودان و سەرخەوشكاندن بـەرەو بـن سـێبەری درەختێـك، يـەكێكی دی بـۆ جێگايـەكی ديكـە...پـاش تێپەڕبوونی ماوەيەك، فەرماندارى سوپاكە دووبارە فـووی كـرد بـە (بوق)ەكەيدا، بەڵام ئەم جارەيان فەرمانی (گردبونەوە)ی دەركرد.

هەموو سەربازەكان بە بيستنی زەنگـی ئاگـادارى، پێكـڕا بـەبێ دوودڵی و ياخيبوون فەرمانی گەورەكەيان بـەجێهێنا و بـە چـەك و تفاقيانەوە بەرەو شوێنی مەبەست ڕايانكرد و لەوێدا كۆبوونەوە.

بەوێنـــەی ئەمـــە خواوەنــدی بەديهێنـــەريش هـــەركات نۆبـــەی زيندووبوونـــەوە هـــات فـــەرمان دەدات بـــە حـــەزرەتی(ئيســـرافيل) فوبكـات بـە صـوردا. لەگـەڵ ئەمـەدا گيـان (ڕوح)ەكـان زەنگەكـە دەبيستن.

هەریەکە دەچێتە نێو جەستەی خۆیەوە و هیچ کام لەوانە دواناکەوێت لە جێ بەجێکردنی فەرمانەکە...



چونکە فەرمان لە لای خواوەیە. ئەگەر فەرماندەیەك کەمرۆڤێکی ئاساییە بە لێدانی بوقێك بتوانێت هەموو سەربازەکان کۆبکاتەوە، ئەوە بێگومان خاوەندێکی خاوەن دەستەڵات و فەرمانڕەوای ڕەها بە فەرماندان لە ڕێگەی (صور)ەوە ئادەمیزادی هەموو سەردەمەکان بانگ دەکات و جەمیان دەکات...

دەربارەی بەبەردا چوونەوەی گیان و ژیانەوەی جەستەکان لە یەك ساتدا هەمان کتێب نموونەیەکی لەم جۆرەی داوە:

"بیرلە شارێك بكەرەوە، شارێك كە ملیونەها گڵۆپ پێكەوە لە هەمان كاتدا دەدرەوشێتەوە...

پێدەچێت كارەبای هەموو شارەكە لە یەك ناوەندەوە بدرێت. ئەگەر تەنیا یەك سویچی ئەو ناوەندە هەڵبدەیتەوە هەموو گڵۆپەكان دەكوژێنەوە. دووبارە بیكەیتەوە لە چركەیەكدا هەموو یان دادەگیرسێنەوە. هەرچەند ملیۆنەكە پێكەوە دادەگیرسێت... گەربمانەویٚ دەتوانین گڵۆپی هەموو شارەكان، بگرە هەموو ڕووی زەوی بكەینە چراخان و ناوەندی كۆنترۆڵەكە یەك شوێن بێت، ئەوا ئەو كات داگیرسان و كوژانەوەی پێكڕای گڵۆپەكان لەو ناوەندەوە و لە چركە ساتێكدا، بەیەك جوڵ جێبەجیٚ دەبێت.

بێگومان گەر كارەبایەك كە بەدیهێنراوێكی یەزدانە و خراوەتە خزمەتی ئادەمیزادەوە ئاوابێت، بە تەنیا فەرمانێكی زاتی ئەو، ملیارەها جەستە دووبارە زیندوو دەبنەوە و ژیانیان دەكرێتەوە بەبەردا. ئەویش لەیەك ساتدا...

# چۆن ئینکاری بوونی خودا دەکەن ؟



شتێکت پێ بڵێم، "سەیرو سەمەرەترین شتی دنیا بریتیەلە ئینکاریکردنی بوونی خودا."

بەڕاستی لە گەردونێکی وادا، ئینکاری بوونی بەدیهێنەر و بڕوابوون بەوەی هەموو شتێك لە خۆیەوە یاخود بەڕێکەوت هاتووەتەکایەوە، سەیرترین شتی دنیایە.

بیروباوەڕێك کە پێی وابێ "خۆی لە خۆیەوە دروست بووە، گەشەی کرد و هاتەبوون." دەربارەی گەردونێکی وەها بە هەموو پێکهاتەکانیەوە هەر لەڕووەکەکانەوە تاکو زیندەوەر و ئادەمیزاد، ملیۆنەها زیندەوەری دەرناسای دیکە، هەروەها "ئینکاری بوونی خودا" بۆ ناکۆتا لە ژیرییەوە دوورە.

بۆیە سەرەڕای بوونی هەموو ئەو بەڵگانەی لەپێش چاوماندایە، هەرلە خۆرەوە هەتاکو مێروولەیەك کە هەریەکێکیان مۆری بەدیهێنەری تاقانەی پێوەیە، ئینکاری کردنی بوونی خودا جێگەی سەرسوڕمانە، لەبەر ئەوە مافت پێدەدەم بڵێیت (چۆن ئینکاری بوونی خودا دەکەن ؟)...

## خوانەناسان (ئاتیست) چەند بەشن؟

بێگومان بیستومانە، ئەوانەی دەڵێن "بڕوام بە بوونی خودا نییە" پێیان دەوترێت ئاتیست. ئاتیستەکان بانگەشەی باوەڕنەبوونیان بەخودا دەکەن و دەڵێن:

"بەدیهێنەرێك بوونی نییە و هەرگیز ناشێ ببێت"

لە هەمان کاتدا بەو کەسانە دەوترێت بێ باوەڕ (کافر). ئەگەرچی کاتێك پێ یان دەوترێ (ئاتیست) پێیان خۆشە، وەلێ کەپێیان دەوترێ بێ باوەڕ (کافر) هەندێك پێی تێك دەچن.

لەبەر ئەوە ئاتیست وشەیەکی بیانییە، وەك بایلۆجیست ، گیتاریست ...هتد پێدەچێت هەوای جۆرە پیشەیەك ببەخشێت... واتە:

- باوەڕت بەبوونی خودا هەیە؟
- نەخێر! من ئاتیستم.
- کەواتە ئاتیستیت !؟ زۆر سەیرە... !

بڕوانە! دەڵێی پیشەیەکە، وانییە؟

کەچی ناکرێت بڵێت: "من بێ باوەڕ (کافر)م !"

هەرچۆنێك بێت، ئاتیست یاخود بێ باوەڕ هەر دووکیان بنەماکەیان هەمان شتە. هەردوو باوەڕیان بە خودا نییە و پێیان وایە گەردوون خۆی لە خۆیەوە هاتووەتە کایەوە...

بەڵام مادام ئەوان وشەی بێباوەڕ (کافر)یان حەز لێ نییە، با ئێمە پێیان بڵێین (ئاتیست).

بەڵێ، وتمان چی؟ " ئاتیستەکان دەکرێن بە چەند بەشەوە؟"

ئاتیستەکان لەناو خۆیاندا دەکرێن بە دوو بەشی سەرەکییەوە.

گروپی یەکەمی ئاتیستەکان مرۆڤ گەلێکی زۆر سەیرن. زۆربەی ئەو کەسانەی دەڵێن "من ئاتیستم!" دەکەونە ئەم گروپەوە. چونکە خوانەناسی ئەمانە خوانەناسیەکی ئاسانە و بەبێ بیرکردنەوەیە.

کاتێك لێیان دەپرسیت :"ئایا باوەڕت بە خودا هەیە؟"

وەڵامێکی لەم جۆرە دەدەنەوە :"هممم، ئئێ... نازانم! ئێستا ئیدی ئەم پرسیارەت لە کوێوە هێنا؟ بەڕاستی هیچ بیرم لێنەکردۆتەوە!

بەڵام ئەگەر هەبوایە، دەمانبینی وانییە؟ وابزانم وانییە، خۆ لەوانەشە هەبێت...

کوڕە وازبێنە بیر لەو شتانە مەکەرەوە..."

ئەو جۆرە کەسانە بیرناکەنەوە، بیر لە هیچ شتێك ناکەنەوە...

بە هاتنی وەرزی بەهار دڵخۆش دەبن، وەلێ بۆیان گرنگ نییە کێ ئەم بەهارەی هێنا!. هەموو لایەك بە گوڵ و گوڵزاری ڕنگاوڕەنگ ڕازاوەتەوە، نابینن ئەوانە خۆی لە خۆیەوە نایەنە بوون...

ئەگەرچی بێبەرین لە هەڵهاتنی خۆر، کەچی ئاوابوونەکەیشی بە گرنگ نازانن...

باش دەزانین بخۆن و بخۆنەوە، بەڵکو کوشتەی گەدەیانن. کەچی بۆ جارێکیش لەتەمەنیاندا ناپرسن "ئەم میوە بۆچی هێندە جوانە؟"

"کێیە لەم پەلە ڕەق و وشکانە گێلاس و سێوی شیرین دروست دەکات" ئەمە شیاوی تاسەمەندی نییە لای ئەوان...

لەبەرئەوە ئیدی گرنگ نییە کێ بەهاری هێنا، کێ باخچەکانی پڕکرد لە گوڵی ڕەنگاوڕنگ، کێ باڵندەکانی کەنار دەریا لە ئاسماندا ڕادەگرێت و ئەو دەنوکە ناوازەیان پێ دەبەخشێت، کێ خۆری درەخشانی وەك چاریەکی مەزن لەڕاسەرمانەوە ڕاگیر کردووە، کێیە ئەو بەخشندەیەی ئێمە بە چەندین نیعمەتی بەلەزەت دەژێنێت.



یاخود ئەسڵەن هۆکاری (مرۆڤ بوون)ی خودی خۆی لەلا بێ بایەخە...

دەربارەی ئەوەی بۆچی لە دنیادایین و دەژین، ڕۆژێك دێت چۆن هاتونەتە دنیا هەر ئاواش بەجێی دەهێڵن، کێ ئەوانەی هێنایە ئێرە و دەیشیان باتەوە، هیییچ بیر ناکەنەوە.

ئەم جۆرەی ئاتیست دەخۆن و دەخۆنەوە و دەخەون، هەرگیز تێنافکرێن. گەر جار جارێکیش پرسیارێك مێشکیان بوروژێنێت دەست بەجێ پاڵی پێوە دەنێن بە بیانووی ئەوەی "ئامان، دەخیلت بم، بابیر لەو بابەتە وردانە نەکەمەوە ئەگینا دوایی ئەقڵم لەدەست دەدەم".

ئەمانە بۆ ڕەتكردنەوەی بوونی خودا هیچ كۆششێك ناكەن. تەنیا ئەوەندەیە كە قبوڵی ناكەن. زیهنیان بەم بابەتانەوە ماندوو ناكەن...

ترێ دەخۆن وەلێ پرسیار لە باخەوانەكەی ناكەن...

با باسی گروپەكەی دی بكەین...

گروپی دووەمی ئاتیستەكان بەوێنەی تاقمی یەكەم ترێكە دەخۆن، بەڵام جیاوازی ئەمانە ئەوە دەڵێن:

"باخەوانێك بوونی نییە! ئەو ئیدی لەكوێوە هات! كێ ئەفسانەی ئەم باخەوانەی دروست كردووە؟ ئەم باخ و ڕەزانە خۆیان لە خۆیانەوە دروست بوون، گەشەی كرد و تەنیا خواردنەكەی لەسەر ئێمەیە..."

ئاخر ئەمانە لەبری گوێ نەدان بە باخەوان بگرە بوونیشی ڕەتدەكەنەوە، تەنانەت بانگەشەی نەبوونی باخەوانێك دەكەن. سەبارەت بەهۆكاری نەبوونیشی لەدووی بیرۆكەگەلێك دەگەڕێن. هەڵدەستن بەلێكدانەوەی چۆنێتی خود پێگەیشتنی ڕەزێك و ترێگرتن بەبێ ئەوەی پێویستی بە باخەوانێك ببێت.

بەدرێژای تەمەنیان هەوڵدەدەن كەسانی تریش پاشگەز بكەنەوە و بێباوەڕیان بكەن لە بوونی باخەوان.

باوەڕ بەباخەوان ناهێنن، باوەڕ بە نەبوونی باخەوان دەكەن.

بەڕاستی کاری ئـەم ئاتیسـتانە زۆر ئەسـتەمە. چونکە ناچـارن ڕاسـتی بانگەوازەکـەیان بسـەلمێنن. دیـارترین تاکـەکانی ئـەم کۆمەڵگەیە پیاوانی زانست (زاناکان)ن.

ئەوە تاکو ئێستا نزیکەی دوو سـەدەیە لـە هـەوڵی چەسپاندنی بیرۆکەی پەیدا بـوونی ژیـان بەڕێکەوتـدان، دەیانـەوێت بڵـێن دنیـا خۆی لە خۆیەوە دەرئەنجامی چەند ڕوداوێکـی یـەک لـە داوی یـەک هاتۆتە بوون.

بیرۆکەیەکیان هەیە بەناوی (بیردۆزی گەشـە)وە. لەبـەر ئـەوەی هـەرگیز نـەیانتوانیووە بیسـەلمێنن هـەر بـیردۆزێ دێـت و بـیردۆز دەڕوات.

لەلایـەکی دیکـەوە گـەورە ئاتیسـتەکان لەبەرئـەوەی بڕوایـان بەبوونی بەدیهێنەرێك نییە ناچارن بڕوا بە (بیردۆزی گەشە) بکەن. چونکە دەبێت وەڵامێکیـان پـێ بێـت بـۆ پرسـیاری "ئەگـەر خـودا بەدینەهێناوە ئەی کێ بەدی هێناوە؟"

بەڵێ تاکە وەڵامی گەورە زانایانی ئاتیست هەمان ئەم (بیردۆزی گەشە)یەیە کە هەرگیز نەسەلمێنراوە. ئەم بیردۆزە لەگەڵ ئـەوەی پشت ڕاست نەکراوەتەوە، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ شێوەیەکی گاڵتەجاڕیتر وەردەگرێت.

بـەبڕوای هـەوادارانی (بـیردۆزی گەشـە) هـەموو شـتێکی نـاو گـەردوون بـە زیندەوەرانیشـەوە، لـە ئـەنجامی چـەند ڕێکـەوتی

کتوکوێرەوە، پاش ملیۆنەها، بگرە ملیارەها، ساڵ هاتووەتە بوون.

بەڕای ئەوان بەدیهێنەرێك لە ئارادا نییە. هەموو شتێك لە خۆیەوە ڕویداوە.

ئەم بیرۆکەیە و هاو وێنەکانی بۆ ماوەی دوو قەرنە، لە لایەن بەناوبانگترین زاناکانەوە (!) لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامەوە و گۆڤارە فرە خوێنەرەکان دەنوسرێن و وێنەیان دەکرێت:

بگرە تاقمێك لەو زانایانەی کە دەڵێن " باسی سەرچاوەی ژیان دەکەم، بەڵام ئامان سەد ئامان نابێت ناوی خودا بێنم، هەرچییەکی دیکە بڵێم گرنگ نییە" بیرۆکەیەکی دیکەیان داناوە کە دەڵێت:

"چەند جوتیارێکی ئاسمان لە چەند گالاکسی دوورەوە هاتن و تۆوی ژیانیان لەسەر ڕووی زەوی چاند"

ئەمەشیان بە هەمان شێوە، لەسەر شێوەی چەند وێنەی - ڕۆمان لەناو هەمان ئەو گۆڤارە ناودارانە(!) بڵاو دەکرایەوە.

هەندێ کەسی عەقڵ بەستوویش کە بڕوایان بە جوتیارە ئاسمانیەکان کرد ئیدی ڕێچکەی تایبەتیان بۆ خۆیان دروست کرد و جوتیارە ئاسمانیەکانیان پەرست..

ناوی (گەشە) یان هەرچیەکی لیٚ بنێن، ئاتیستەکان بڕوایان بە ڕێکەوت هەیە، ئەویش ڕێکەوتێکی کتوکوێر...

باوەڕیان بەبوونی خواوەندێکی مەزن نییە، وەلیٚ خودایەکیان بۆ خۆیان دروست کردووە، ئەویش (خودای ڕێکەوتی کتوکوێر).

ئاتیستەکان ئەو خواوەندە بێبنەمایە دەپەرستن. چونکە باوەڕیان وایە هەر لە خۆرەوە هەتا مێرووولەکان لە ئەنجامی چەند ڕووداوی زنجیرەی ڕێکەوت ئامێزی کتوکوێرەوە هاتونەتە بوون...

نالێن "الله گەردوونی بەدیهێناوە" بە پێچەوانەوە دەیدەنە پالٚ شتانی بیٚدەستەلاٚتی وەك ڕێکەوت، سروشت، خۆی لە خۆیەوە، دەلێن ملیارەها ملیار سالٚ گەشەی کرد، هات و چوو، ئەستوور و باریك بووەوە، زیادی کرد و لێی بووەوە... دواجار بەم جۆرەی لێهات".

پتر لە هەموو شتێکی دیکە باوەڕ بە بیردۆزی گەشە دەکەن کە پێش دووسەد سالٚ دروستیان کردووە.

ئەمە لەگەلٚ ئەوەی پێیان وایە چەند جوتیاری ئاسمانی هاتوون و ژیانیان لەسەر زەوی چاندووە.

واتە باوەڕ بە هەموو شتێك دەکەن بێجگە لە (خودای تاقانە)...

## تەنانەت وێنەی پەپولەیەکیش...

بێشــک هــەموو ئاتیســتێك بــڕوای بــەبوونی خــودا نییــە، بــا گــەورەترین پرۆفیســۆری کیمیــای ئەنــدامی بێــت، بــا زانایــەکی بەئەزموونی وا بێت کە چەندین خەڵاتی نۆبڵی بەدەست هێنا بێـت، ئەگەرچی پرۆفیسۆرێکی بەتەمەنی وانەی فەلسەفە بێت لـە بـەناو بانگترین زانکۆی جیهان، تەنیا بڕوای بە (ڕێکەوت) هەیە.

بانگەشەکردن بۆ هاتنەبوونی زەوی و ئـەوەی لـەڕوی زەویدایـە لەئەنجامی ڕێکەوتێکی دووووور و درێـژەوە گـەلێك گەمژانـەترە لـە بڕیـاردان لـە سـەر خودبـوونی وێنەیـەك - بۆنمونـە وێنـەی ئـەو پەپولەیەی لەسەر مێزەکەیە- بەبێ وێنە کێش.

هیچ نەبێت بەئەندازەی جیـاوازی نێـوان وێنـەی پەپولـە لەگـەڵ پەپولەیەکی ڕاستەقینەدا، گەمژانەیە!



ئاتیستەکان بڕوایان وایە پەپولەیەك بەو باڵە نەخشینانەیەوە، بەو جەستە ئەندازەییەوە، پەرواز لەسەر ئەم گوڵ بۆ ئەو گوڵ - هەم پەپولەیەکی زیندوو، بەرهەمی ڕێکەوتێکی کتوکوێری چەندین ملیار ساڵەیە. وەلێ هەرگیز گریمانەی ئەوەیان بۆ دروست نابێت وێنەی پەپولەیەك لەخۆیەوە بکێشرێت!

ئایا سەرت سوڕنامێنێت لەوە؟! پێیان وایە پەپوولەیەکی زیندوو دەرئەنجامی ڕێکەوت دێتەبوون کەچی بڕواناهێنێنن بە دروست بوونی وێنەی هەمان پەپوولە لەسەر پەڕەی کاغەزێك خۆی لە خۆیەوە. ئەگەرچی ئەو وێنەی پەپوولەیە نەك وێنەکێشێکی دەستڕەنگینی بەناوبانگ بەڵکو لەلایەن منداڵێکی بچوکیشەوە دروستکرابێت بە ناشرینییەکی وا کەهەموو کەسێك نەزانێت وێنەی پەپوولەیە!



نەخێر! باوەڕناهێنن، بۆ ساتێکیش بێت باوەڕناهێنن ئەو وێنە شقلّ وپقلّیە کاری دەستی ڕێکەوت بێت..

بەلاّم پەپوولە پەراوزەکانی نێو باخچەکان بە خەلاّتی دەستی ڕێکەوت دەزانن.

بڕوا بەو وێنەیە ناکەن، وەلێ بڕوادەکەن پەپولە کە زۆر جاران لەناو چاوێکدا (١٧٠٠٠) گچکەچاوی لەخۆ گرتووە - بەکاری ڕێکەوت دەزانن!

هاتنە بوونی پەپوولە (کۆلیاس) - کە ئەگەر پلەی گەرمی لەشی لە (٢٨) پلەی سەدیەوە دابەزێت ئەوا ناتوانن بفڕن، لەپێناو گەرمکردنەوەی بەدەنیاندا باڵەکانی دەکەنەوە و پشتیان دەکەنە بەر تیشکی هەتاو- بەدەرئەنجامی ڕێکەوت دەزانن.

یەك لە سێ بنەماکانی زانستی ڕووناکی دەڵێت:((بە نزیکبوونەوەی گۆشەی لێکەوتی تیشکی خۆر لەسەر هەر تەنێك لە گۆشەی (٩٠°)ەوە، پلەی گەرمی ئەو تەنە زیاد دەکات)). جوڵانەوەی پەپوولەکان دەقا ودەق لەسەر ئەم بنەمایە، بەڕێکەوت دەزانن.

کاتێك پلەی گەرمی جەستەیان (٤٠°) تێدەپەڕێنێت، بەپێچەوانەی ئەوەی پێشووەوە لەبەرامبەر خۆردا جموجوڵ دەکەن تاکو پلەی گەرمیان دابەزێت، ئەمەش بەڕای ئەوان هەر ڕێکەوتە.

بوونی پەڵەو خاڵی بچووك لەنێوەندی ڕەنگی ڕەشی باڵەکانیاندا ـ کە زووبەزوو گەرم دادێت ـ بەڕێکەوت دەزانن!

جێگیربوونی ئەم پەڵانە لەنزیك ئەو بەشانەی جەستەی پەپوولەکەوە کە زۆرترین پێویستی بەگەرمی هەیە، هەر ڕێکەوت و هەوانتەیە بە بۆچونی زانایانی هۆکارپەرست!

بوونی ئەو هاوسەنگیە ناوازایە لەسەرپشت وباڵی پەپوولە ـ لە کاتێکدا هەرگیز پەپوولە پشت و باڵی خۆی نابینێت ـ بەڕای ئەوان ڕێکەوتە.

(پەپوولەی چەتاڵکلکی) لە ئەفریقا، باڵەکانی لە سەدا هەزار پەڕەی ورد پێك دێت و هەریەکەیان بەڕەنگێکی ئێجگار ناوازە و سەرنج ڕاکێش ڕەنگکراون. نەخش و نیگاری سەرباڵی ئەم پەپولانەش هەر ڕێکەوتە بەبڕوای زانا ئاتیستەکان.

باڵی ئەم پەپولانە بەوێنەی ئاوێنەیەکی ئەفسوناوی تەنیا چەند ڕەنگێکی سەری لەبەر تیشکی خۆردا دەدرەوشێتەوە و دیمەنێکی دڵڕفێن دروست دەکەن لەکاتی فڕیندا. ئەو درەوشانەوەیەش لەسەر تەنیا چەند ڕەنگێك، بەڕای ئەوان هەر ڕێکەوتە.

هەموو ئەوانەی باسمانکردن ڕێکەوت بێت، وەلێ کێشانی وێنەی پەپولەیەکی بێگیان لەسەر پارچە کاغەزێك ناکرێت ڕێکەوت بێت،

ئەمــە لەگــەڵ ژیــری کێــدا دەگونجێــت؟! ئەگەرچــی وێنــەکێش منداڵێکی پێنج ساڵەش بێت، ئەو وێنەیە دەبێت هەر وێنەکێشێکی هەبێت...

خۆ لەڕاستیدا کاتێك دەچنە بنج و بناوانی پەڕە زۆر وردەکانی باڵی پەپوولەوە و لێی دەکۆڵنەوە و دەزانن گەرچی ملیارەها ملیار ساڵیش تێپەڕێ هێشتا ناکرێت بەڕێکەوت بێتەبوون.

بەهەمان شێوە ئەوە دەزانن کەناکرێت وێنەیەك بەبێ وێنەکێش بکێشرێت بەڵام نایانەوێت باوەڕ بە بەدیهێنانی بەدیهێنــەری مــەزن بهێنن.

لەکاتێکــدا بەدرێــژای ژیانیــان نەیانبیســتووە و نــەیانبینیووە پێنوسێك هەبێت لەخۆیــەوە بەڕێکــەوت لەســەر پــەڕەی کاغــەزێك وێنەی پەپوولەیــەك بکێشــێت. وەلێ ســەبارەت بەدرووســت بــوونی پەپوولەیەکی زیندوو، فڕیــو لــەم چڵ بــۆ ئــەو چڵ، ماچــی گــوڵان دەکات، ڕەنگەکانی لەبەر تیشکی هەتاودا نمایش دەکات و ئــارامی بە چاوانی ئێمەش دەدات، بانگەشەی ڕێکەوت دەکەن.

بەڵێ، ئینکاری بوونی خــودا بــەم جــۆرە شــتێکە لەگــەڵ ژیریــدا ناگونجێت و شیاوی بڕواپێکردن نییە.

# ئایا زانایەك چۆن باوەڕ بە بوونی خودا ناهێنێت؟

بەتایبـەت کۆمەڵـە زانایـەك کـە هـەموو تەمـەنی خۆیـان بـۆ لێکۆڵینەوە و گەڕان بـەدوای موعجیزەکانی ژیانـدا ـ بـە بێگیـان و گیاندارەوە ـ تەرخان دەکەن، ڕەتکردنەوەی بوونی خـودا لەلایـەن ئەوانەوە کارێکی یەکجار سەرسوڕهێنە!

بێگومان ناڵێم هەموو زانایان بەم جۆرەن،

چـەندین زانـای گـەورە هـەن وەك (ئەنیشـتاین) و (لـویس پاستەر) کە بڕوای تەواویان بەبوونی خودا هەبووە و هەیە.

بەتایبەت لەم ساڵانەی دوایدا زانایان دوای تەمـەنێك لـە (هۆکـار پەرسـتی) لەکاتێکـدا لێکۆڵینـەوەکانیان تـەواو دەکـەن و ئـەنجام دەدۆزنەوە ناچار بڵێن:

"ئیدی بەسە! تاکو ئێستا لـە هەڵـەدابووم و لەمـەزیاتر بەرگـە ناگرم، بۆم دەرکەوت کە خودا هەیە! "

وەلێ من دەخوازم هەموو زانایان کە دۆزینەوەی ناوازە دەکەن بڕوا بەبوونی خودا بهێنن. ئەوکات بەتامەزرۆیەکی زیاترەوە دەمڕوانیە دۆزینەوەکان. چونکە هەرکاتێك سەیری دانەیەك لەو دۆکۆمێنتەریانە دەکەم لە تەلەفزیون، لەناخەوە حەزدەکەم دەنگی تەلەفزیۆنەکە بەتەواوی ببڕم. بۆ وێنە ئەو پەپولەیەی تۆزێك پێش ئێستا بۆ تۆم باسکرد، لەدوای بینینی ئەو هەموو لایەنە ناوازانەیان ناتوانم گوێ ڕابگرم بۆ بڕێك هەڵیت و پەڵیتی وەك (هەموو ئەمانە موعجیزەی دەستی سروشتە، بەڵێ سروشت بۆ هەر کارێکی گران وەها چارەسەرێك دەدۆزێتەوە !..).

سەرەڕای لەنزیکەوە بینینی هەموو ئەو کارە دەراسایانە، تێناگەم بۆچی هەندێك زانا دەبن بە (ئاتیست) !

لەبەرچی وازدەهێنن لە بڕوابوون بەخودا، کەچی لەلایەکی دیکەوە هاتنەبوونی زیندەوەران دەدەنە پاڵ ڕێکەوت، گەشەکردن و لەخۆوە بوون ! ؟

ڕاستی پێویستە ئەوان لەهەمووکەس زیاتر خودا بناسن و باوەڕی پێ بهێنن، چلۆن ئینکاری بوونی دەکەن؟

داخۆ دڵیان تێناگات، چاویان نابینێت، گوێچکەیان نابیستێت؟

# تابلۆ و باڵی پەپوولەکە

ئەگەر کەسێك دەربارەی تابلۆیەکی (پیسکاسۆ) بکۆڵێتەوە و بدوێ، بەڵام هەرگیز ناوی (پیسکاسۆ) نەهێنێت، ڕۆڵی ئەو لەو تابلۆیەدا بەهیچ لە قەڵەم بدات و بڵێت ((ئەم تابلۆیە بەجۆرێك دروست بووە کە کۆمەڵە ڕەنگێك هاتوون لەدەوری یەك گردبوونەتەوە بەڵام کۆمەڵێ ڕەنگی تر هەن نەهاتوون)). ئایا هەموو کەسێك بەمە پێناکەنێت.؟

ئەوکات خەڵکی تێدەگەن، ئەوکەسە گەمژەیە و بە هیچ جۆرێك لە هونەر، ستاتیك و جوانیەکان تێناگات...



باشه بەڕای تۆ بۆچونی کۆمەڵێك زانای ئاتیست کە لایان وایە:
(نەخشەسازی باڵی پەپوولەیەك لەئەنجامی بەر کەوتن و درەوشانەوەی کۆمەڵێك تیشکی خۆر لەسەر باڵی پەپوولەکەدا و نەدرەوشانەوەی کۆمەڵێکی دیکەیان هاتووەتە بوون و تەنیا یاریەکی ڕەنگ بازییە) چ دەگەیەنێت ؟

ئەگەر بەبێ بوونی پیکاسۆ تەماشای تابلۆکە بکەی ئەوا ناتوانیت وەك تابلۆیەکی هونەری ناوازە بیبینیت...

بەهەمان شێوە، کەتەماشای باڵی پەپوولەیەك دەکەیت، گەر (خودا) یادی خۆت نەهێنیتەوە ئەوا ناتوانیت بەسنعەتێکی مەزن و موعجیزەیەکی بەدیهێنەر بیبینیت...

ئیدی هەر لەبەرئەوە زانایان لەکاتێکدا دەبووایە لە هەمووکەس زیاتر بڕوایان بە خودا هەبووایە، وەلێ ئینکاری بوونی ئەو دەکەن.

چونکە کاتێك بە هیی ئەوی تەماشا ناکەن، ئەوا هیچ جوانیەکی خودایان یاد ناخاتەوە.

پەپوولەیـــەك ، گوڵێــك ، درەختێــك ، چـۆلەكەیەك ، شـــینە نەهـەنگێك... لەچـاوی ئەوانـدا وەك سـنعەتێكی نـاوازەی دەسـتی پەروەردگار دەرناكەوێت...

هەموو ئەوانە دەگەڕێننەوە بۆ ئەوەی كۆمەڵێك گەردیلە و گەرد بەڕێكەوت كۆبوونەتەوە و خانـەیان پێك هێنـاوە، هـەر بەڕێكـەوت چـــەند خانەیـــەك كۆبونەتـــەوە لـــەدەوری یـــەك و بوونـــەوەرانیان دروستكردووە.

لەبەرئەوەی بەوجۆرە دەڕواننە ئـەو موعجیزانـەی پـەروەردگار، هەموو تاكێك لەو شتانەی تەمەنێك بەلێكۆڵینەوە و گەڕان تیایانـدا خەرج دەكەن، نەك بەرەو ناسینی بەدیهێنەری ڕاستەقینە بیانبـات بەڵكو بەپێچەوانەوە دوورتریان دەخاتەوە.

لـە پەپوولـەكان دەكۆڵنـەوە، ئینكـاری ئـەوە دەكـەن خـودا بەدیهێنابن... بۆیـە بـە ئەنـدازەی ژمـارەی پەپوولـەكان لـە خـودا دوور دەكەونەوە...

پاشان لە گوڵەكان دەكۆڵنـەوە، ئینكـاری ئـەوە دەكـەن خـودا بەدیهێنابن... بۆیە بەئەنـدازەی ژمـارەی گوڵـەكان لـە خـودا دوور دەكەونەوە...

دواتـر دەكەونـە لێكۆڵینـەوەی باڵنـدەكان، ئینكـاری ئـەوانیش دەكـەن خـودا بـەدیهێنابن، بۆیـە بەئەنـدازەی ژمـارەی باڵنـدە پەروازەكانی ئاسمان لە (باوەڕ بەخودا)ەوە دوور دەكەونەوە...

بەقەد ژمارەی نەهەنگ و حوتەكانی زەریاكان لـە خـوداوە دوور دەكەونەوە...

بەئەنـدازەی دار قۆخـەكان و ژمـارەی میـوەی سـەر پەلـەكان لەخودا دوور دەكەونەوە...

بەئەنـدازەی چـیاكان، خـۆر و مـانگ و هـەموو ئەسـتێرە و هەسارەكان لە خودا دوور دەكەونەوە كاتێك هەر شتێكیان نیشـان دەدەیت و ئەوان دەڵێن "خودا بەدی نەهێناوە ". ئیدی وەك بڵێیت (ئەو شتە دەچێتە نێوان ئەوان و خوداوە)!

ئیدی ئەمە بەردەوام دەبێت و دەڕوات...

هێندە لە (باوەڕ بە خودا)ەوە دووردەكەونەوە، كـە دوای ئـەوە دەچنە دەرەوەی بازنەكە، ئیدی ناگەڕێنەوە.

وەك خۆیان ناگەڕێنەوە، ئێمەش بۆلای خۆیان بانگ دەكەن!

فیلمە دۆكۆمێنتەریەكان دەگرن...

پەرتووك دەنووسن...

كۆنفراس ئەنجام دەدەن ...

بــەخۆیان و قردێلــەکانی ملیانــەوە، ورگــی دەرپــەڕیویان، بانگەشەی ئەوەی (من زانام، هـەموو شتێك دەزانم) دەچـنە سـەر تەلەفزیۆن و وتاردەدەن.

دەڵێن:

"کاری سروشتە، بەڕێکەوت هاتۆتە مەیدان. کاکی خـۆم ئەمانـە چـەند ملیـار سـاڵە هـاتووە هـاتووە، گەشـەی کـردووە تـاکو گەشتووەتە ئەم ئاستە و ئاوای لێهاتووە..."

وەڵێ تەنها باڵی پەپوولەیەك، کە ناوازەیە لە ناسکی و جوانیـدا، بەسـە بـۆ ئـەوەی بەرپەرچـی هـەموو قسـە بـێ ماناکـانی ئـەوان بداتەوە و ڕاستیەکە بخاتە بەرچاومان...

چونکە بـە زمـانی حـاڵ دەڵێـت: "پـەروەردگار منـی درووسـت کردووە"

هـەروەها بـە هـەموو جوانیەکانیـەوە ئـەم ئایەتـە پیرۆزەمـان وەبیردەهێنێتەوە:

"ئەمەی باسم کـرد ئەوەیـە کـە خـوا دروسـتی کـردووە، دەسـا ئێـوە بـێن بیخەنـە بەرچـاوم ئەوانـەی ئێـوە لـە خـوا بـەولاوە ئەیانپەرسـتن چـییان دروسـت کـردووە؟ دیـارە هیچـیان دروسـت نـەکردووەو نایشـتوانن هـیچ دروسـت کـەن، بـەڵام سـتەمکاران لـە گومڕاییەکی ئاشکراو دیاردان." لقمان: ١١

# بۆچی پێویستە ئاشنابین بە ناوە جوانەکانی پەروەردگار؟



خوای گەورە دەفەرموێت : "ئەو زاتە ناوی (الله)یە، کەس نییە بەڕاستی بەندەیی بۆ بکرێ ئەو نەبێ. ئەوە ناوە جوانەکانی هەیە کە نەوەدونۆ ناون." طه: ٨

وادابنێ دۆستێکت هەیە بەناوی (ماهیر)ەوە. با ئەو باخەوانێکی ماهیری وابێت کە چەندین جۆری جیاوازی گوڵ و گوڵزار لە باخچەکەیدا دەڕوێنێت. بەڵام لێهاتووی (ماهیر) تەنیا لە چوارچێوەی باخەوانیدا سنوردار نییە.

ماهیر لەهەمان کاتدا دارتاشێکی نێجگار کارامەیە. لە شوێنی کارەکەیدا لە کەرەستە و تەختە سەرەتاییەکانەوە گەلێك مێز و کورسی و شتی دیکە دروست دەکات...

**له هـهمان کاتـدا مـاهیر چێشـتلێنەرێکی زۆر دەسـت ڕەنگینـه ! ناوبـانگی خواردنـه بەتامـەکانی لـه هەموولایـەکی شـارەکەدا بـڵاو بۆتەوە.**



وادابنێ ماهیر سەرەڕای ئەوانە، نیگارکێشێکی بەتواناشیە.

لەبەر ئەوهەموو لێهاتوێتیە، بێجگەلە (باوە ماهیر)، ماهیر بەم ناوانەشەوە بانگدەکرێت:

باخەوان

دارتاش

چێشتلێنەر

نیگارکێش



تا چ ئەندازەیەك ماهیر بناسیت، تا چ ڕادەیەك درك بە توانا و لێهاتووی ئەو، تایبەتمەندی و ناوەکانی ئەو بکەیت، ناوی (ماهیر) تاکو ئەو ئەندازەیە مانا و تێگەشتنی هەیە لای تۆ.

کاتێك ناوی ماهیر دەهێنیت، تێدەگەیت کە لەهەمان کاتدا بانگی باخەوانێك، دارتاشێك، چێشتلێنەر و نیگارکێشێکیش دەکەیت.

هەرکاتێك پێویستت بە گوڵ بوو بەبێ ئەوەی بچیتە لای کەس، ڕاستەوخۆ دەچیتە کن (ماهیر)، بەڵام ئەو ماهیرەی کە یەکێك لەناوەکانی (باخەوان)ە.

گەر پێویستت بەکورسی بوو، ئەوا تەنیا لە ماهیر داوادەکەیت، وەلێ ئەو ماهیرە یەکێك لە ناوەکانی (ماهیری دارتاش)ە.

ئەگەر حەزت لە تابلۆیەك کرد بە دیواری ژوورەکەتدا هەڵیواسی، ئەوا تەنیا لەدەرگای ماڵی ماهیر، واتە (ماهیری نیگارکێش) دەدەی بۆ دەستخستنی تابلۆکە.

ئەگەر پەیت نەبردایە بە لێهاتووییە فرەچەشن و زۆرەکانی ماهیر و ناوە جیاوازەکانی ئەو، ئەوکات وشەی (ماهیر) لەلای تۆ مانایەکی جیاوازی نەبوو.

ئەگەر وترابا: "ماهیر کێیە؟"

دەتووت: "ماهیری خۆمان ئیدی !"

نە دەتوانی باسی گوڵە هەمەڕەنگ و جوانەکانی پێگەشتووی دەستی ئەو بکەیت، نە ئەو مێزو کورسییانەی دروستی کردوون...

نە قسەیەکت دەبوو بۆ وتن دەربارەی خواردنە بەتام و بەلەزەتەکانی ئەو، نە وشەیەك دەرحەق بەو تابلۆ ناوازانەی ئەو دەیانکێشێت.

ئەو کات دەتووت: "ماهیر دەڵێیت؟ بەڵێ، دەیناسم، چۆن نایناسم! ماهیر ئیدی"

با ئەم نمونەیەت بیربێت، ئێستا یادەوەریەکی بچوکی خۆمت بۆ دەگێڕمەوە...

بەیانیەک لە (ئوسکودار) سواری بەلەم بووم. ئەو ڕۆژە ڕەشەبابوو. لە مقۆمقۆی نێوان گەشتیارەکانی دیکە، کە ئەوانیش وەک من چاوەڕێی گەیشتنی پاپۆڕەکەیان دەکرد، بۆم دەرکەوت کە ئەمڕۆ (لۆدۆس)[1] بە سەختی هەڵدەکات.



١- لۆدۆس: ئەو ڕەشەبا ناوچەییەی لە باشوور یاخود باشووری ڕۆژئاواوە هەڵ دەکات و هەندێک جاریش دەبێتە باران بارین (لە تورکیا).

لەچەند کاتێکی دیاری کراویساڵدا لە کەنارەکەدا بای لـۆدۆس هەڵدەکات. زۆرجار دەبێتە هۆی وەستاندنی گەشتە دەریاییەکان.

چیتر ناتوانن لەمبەری ئاوەکـەوە بپەڕنـەوە بـۆ ئەوبـەر. ئەگـەر لەکاتێکدا پاپۆڕەکە لەناوەڕاستی دەریاکەدایە لۆدۆس بـەهێزبێت، ئیدی حاڵی گەشتیارەکان پەرێشان دەبێت!!

مـن لەسـەرویەندی ئـەم جـۆرە بیرکردنەوانـەدابووم کـە چـەند ئافرەتێکی بەساڵاچوو لەولاوە بەدەنگی بەرز و دڵشادیەوە قاقایان لێدەدا.

ئەوەنـدە گـوێم لـێ بـوو، ئـەو ئافرەتانـە، دوای کڕینـی هەنـدێ شـتومەك لـەبازاڕی (میسـر) دەچـن بـۆ (بێشـكتاش) بـۆ مـاڵی هاوڕێیەکی زۆر خۆشەویستیان و لەوێ ڕۆژێکی خۆش و پـڕ کێـك و شیرینی بەلەزەت بەسەردەبەن.

بۆ کڕینی هەندێك کەرەسەی تازە،لوقم و چەند دانەیەکی دیکـە دەچن بۆ بازاڕی (میسر). لـەکاتی خـواردنی بـۆرەك و کێکەکانـدا، جارجـار چەرەسـیش دەکـرمێنن. هەڵبـەت زەمکـردن بـەوجۆرە تامێکی تایبەتی تری دەبێت...

لەو سەرویەندانەدابوو پاپۆڕەکە لە شـوێنی لەنگـەرگرتنی نزیـك دەبـووەوە، کەوتـە لـەرزین. جـیڕەی پـیرە بەلـەم دڵـی سـەرجەم گەشتیارانی داخورپاند.

بەڵێ بەم جۆرە، ئەو (لۆدۆس)ەی چاوەڕوانی دەکرا هەڵیکرد!

پاپۆڕەکە کەوتە جوڵە و لەقە بەملاولادا. تا دەهات بەهێزتر دەبوو. سەرەتا دەنگی قاقای پوریێ دڵخۆشەکان و دواتریش تەواوی دەنگەکان بڕان...

پاپۆرەکە بەجیڕە ترسێنەرەکانی بەردەوام بەرزونزمی دەکرد لەناو ئاوەکەدا. جارێك بەشێوەیەك جیڕەی کرد و بەلادا هات، وتم: (ئیدی ڕاست نابێتەوە).

یەك لە ئافرەتەکان هاواری لێ بەرز بووەوە " ئای خوایە ! "

پاپۆرەکە ڕاست بووەوە، وردەوردە لە کەنارەکە نزیك دەبووەوە. یان (لۆدۆس)ەکە تێپەڕیبوو یاخود ئێمە لە (لۆدۆس) تێپەڕیبووین.

ئەو ئافرەتەی ساتێك پێش ئێستا لەترساندا هاواری لێبەرز بووەوە، ئێستا کەوتۆتە بیری لوقم کڕین، لە هاوڕێکەی پرسی:

"لەکوێ لوقم بکڕین؟ جێگایەك شارەزایت؟ ئەگەرنا بۆی دەگەڕێین دەستمان دەکەوێت. هەرچۆنێك بێت فرۆشیارەکان ڕێگەمان دەدەن سەرەتا تاقی بکەینەوە! ئەوەی هەفتەی ڕابردوو (مەلیحە) خان هێنای هەر کەڵکی نەبوو، دەتوت قوڕە! دایکی من، ئەو ڕەزیلە، ڕەزیل!. لەم ئیستەنبوڵە گەورەیەدا چووە گەڕاوە کامە هەرزانە ئەوەی هێناوە..."

پاپۆڕەکــە تــەواو نزیــك بــوەوە و لەنگــەری گــرت. هــەموو گەشتیارەکان بەخێرای هــەوڵیان دەدا دابــەزن و بــەکاری تاییــەتی خۆیان ڕابگەن...

دابــەزیم لــە پاپۆڕەکــە و بــەرەو شــوێنی کارەکــەم دەڕۆیشــتم ئافرەتــە پیرەکــە هاتــەوەبیرم کەلــە ترســاندا هــاواریکرد (ئــای خوایە!).

لەناخی خۆمدا گفتوگۆیەکی پرسیار و وەڵامم دروست کرد:

–پوریێ بۆچی هاوارتکرد (ئای خوایە)؟

–ئای کوڕە! نەتدی، تۆزێکی مابوو پاپۆڕەکە نقوم بێت!

–باشە دەزانم، ئەدی بۆ هاواری (خودا)ت کرد.

–چیم بووتایە بەڕای تۆ؟ بێجگە لەوە شتێکی دیکە هــەبوو بۆ وتن؟ ترسام و هاواری خودام کرد!

–ئایا هەمیشە لەخودا دەترسیت؟

–بێگومان دەترسم!

–وەلێ هەرکە (لۆدۆس)ە کە دامرکایەوە شــوێنەواری ئەوترســە دیارنەما!!

–ئەوە یەعنی چی ئیدی؟

-هەرکە پاپۆڕەکە لەنگەری گرت، دەستبەجێ دەستانکرد بە پاشملە باسکردنی مەردووم. لوقمەکانی (مەلیحە خان) وەك قوڕ وا بوو، مەلیحەخان زۆر ڕەزیلە...

-لە دەردوبەڵا دووریم خوادیە، بە تۆ چی کوڕە. سەرەڕای ئەوەش من ڕووبەڕوو بەخودی خۆیشی دەڵێم کە ڕەزیلە.

-بەڵام پورێ گیان. خوای گەورە غەیبەت و زەمکردنی لێ قەدەغە کردووین، یەکسانی کردووە بە خواردنی گۆشتی برای مردوو.

- ئای ئای! ئەرێ تۆ مەلایت کوڕم؟

-نەخێر، بەڵام تامەزرۆبووم بزانم کە هاواری خوا دەکەیت، ئەوە چ جۆرە خودایەکە هاواری لێ دەکەیت؟



-ئای ئای، کەس هەیە نەزانێت. خودا خودایە ئیدی !...

....

لەڕاستیدا هـاوارکردنی پـورێی بەساڵاچوو زیـاتر نـەبوو لـەوەی کەسێك لە بەرزاییەکەوە بکەوێتە خوارەوە، بۆ ڕزگارکردنی گیـانی پەلەقاژەیەتی و خۆی بەیەکەم پەلەوە دەگرێتەوە کەدێتە ڕێگەی.

هەروەك چۆن ئەو کەسە بۆی گرنگ نییە کە ئـەو لقە هـی کـام درەختەیە، درەختەکە چ جۆرە میوەیەك دەگرێـت، ئایا گـەڵاکانی درەختەکە پانن یاخود باریك و دەرزیلەین،... بەهـەمان جۆر ئـەو پورێیەش لەترسی نقومبـوونی پاپۆڕەکـە هـاواری (خـودای) کـرد. وەلێ زانیاریـەکی ئـەوتۆی نـەبوو دەربـارەی ئـەو خودایـە، بـەو هەڵسوکەوتەی چەند ساڵێك دوای ڕوداوەکە نواندی دەریخست کـە زۆر بەتەنگ ئەم لایەنەی بابەتەکەوە نییە.

بێگومان خۆی بەپەلێکی ڕاستەوە گرتبووەوە.

گومانی تێدا نییە،پاپۆڕێك و سەرنشـینەکانی نـاوی لەنێوەنـدی گەردەلولێکی بەهێزی وادا و لەناو شەپۆلەکاندا تەنیا و تەنیا خودا دەتوانێ ڕزگاریان بکات.

چـــونکە تـــەنیا هێـــزو تـــوانی خـــودا بەســـەر دەریـــا و گەردەلولەکانیشدا زاڵـــە...

ئەوەی دەست بۆ خودا درێژبکات، خودا دەستی دەگرێت.

بەڵام ناچارم بڵێم ئەو کەسەی تەنیا لە کەش و هەوای ناڵەباردا ناوی خودای بیر دەکەوێتەوە زانیاری ئەو تۆی دەربارەی خـوداپێ نییە.

نمونەکەی تۆزێك بەر لەئێستات وەبیربکەوێتەوە، کاتێك دەڵێـت (ماهیر)، لەئـەنجامی زانینـی لێهاتوویـەکانی مـاهیر و ئـەو ناوانـەی پێدراوە، دەکرێت بزانین چ جۆرە کەسێك بانگ دەکەین. بەجۆرێك کاتێك ناوی ماهیر دەهێنیت:

وادەزانیت کە ناوی باخەوانێك، دارتاشـێك، چێشـتلێنەرێك و لـە هەمان کاتدا ناوی نیگارکێشێکمان هێناوە.

هـەر بـەم جـۆرەش کاتێـك هـاواری خـودا دەکەیت،پـەی بـردن بەوەی گوایا نزا لای چۆن خودایەك دەکـەین و لـە چـۆن خودایـەك دەپاڕێینەوە، تاکو ڕادەی پەی بردن بە ناو و سیفەتە پیرۆزەکانی پەروەردگار کارێکی مومکینە.

ئەگـەرنا کاتێـك پرسـیارمان لێ دەکرێـت (چـۆن خودایـەك؟) لەناچاری و نەزانیدا دەڵـێین "خـودا ئیـدی! کـەس هەیـە نـەزانێت کام خودا! ؟"

پێدەچێت کاتێکیش لێمان دەپرسن: "خوات کێیـە؟" وەڵامێکمـان پێنەبێت ببێتە هۆی ڕووسوریمان..

هـەتا ئەوەساتەی هەناسـە دەدەیـن پێویسـتە هـەوڵی ناسـینی ئافرێنامان بدەین.

دەبێـت هەوڵبـدەین فێـری نـاوە جوانـەکانی ئـەو و واتاکانیـان ببین.

سـەرەڕای بـوونی مامۆسـتایەکی مـەزنی وەك پێغەمبـەر (د.خ)، پـەرتوکێکی پـیرۆزی وەك قورئـان، قوتابخانەیـەکی نـاوازەی وەك گەردوون کە هەر لە مێشوولەیەکەوە تاکو خـۆری مـەزن ئاوێنـەی درەوشـانەوەی نـاوە پیرۆزەکـانی خـودان و تێیانـدا دەسـتەڵات و جوانکـاری ئـەو دەبیـنین، دەبێـت چ بیانویـەك هـەبێت بـۆ سـەعی نەکردنمان و دەرنەچوونمان لەو پۆلەدا!



# ناوه جوانەکانی خودا

سەرەتا پێویستە بزانیت کە ناوە پیرۆزەکانی خودا واتە (أسماء الحسنی)، وەکو ناوەکانی خۆمان نییە کە لەسەر پێناسەکانمان دەنووسرێت.

چونکە ئەوەی ناوی لێدەنێین (ناوی من)، بە تەواوی ناوی خۆمان نییە. بەڵکو باوك و دایکمان پاش ئەوەی هاتینە دنیاوە ئەو ناوەیان لە ئێمە ناوە.

ئێمە لە دواناوەندیدا مامۆستایەکمان هەبوو. ناوی (فیلیز)[١] بوو. ئافرەتێکی گەلێك ڕوخۆش و هێندێکیش قەڵەوبوو. زۆرجار بێزاری خۆی دژی کێشی دەردەبڕی:

"منیان ناوناوە فیلیز، کەچی هیچ شتێکم لە فیلیز ناچێت."

هەم خۆی پێدەکەنی و هەم ئێمەشی دەخستە پێکەنین.

هاوڕێیەکیشم هەبوو ناوی (مولائیم) بوو، کە واتای خوڕەوشتی نەرمونیان و ئارامی هەیە. وەڵێ مولائیمی ئێمە هیچ پەیوەندیەکی دوور ونزیکی لەگەڵ نەرم ونیانیدا نەبوو. لە هەرکوێیەك شەڕوبەزم و هەرا هەبوایە بێگومان ئەو لەوێ بوو. وەڵێ کە ناوی لێی دەپرسیت، دەڵێت ناوم (مولائیم)ە.

---

[١] – فیلیز: چەکەرە، یەکەم لق کە لە تۆوی ڕووەکەوە دروست دەبێت، (زۆر باریك و لاوازە).

(قـودرەت)ێکـیش هـەبوو. بـەڵام هـیچ بـارودۆخێکی قـودرەتی لەودانەبوو.

کوڕێکی گچکەی لاوازی بێدەنگی لەسەرخۆبوو.

قـودرەتی هـەژار هەمیشـە چینێکی باشـی بەدەسـتی مـولائیم دەخوارد، هەڵبەت ئەگەر هـەم مـولائیم و هـەم قـودرەت بەڕاسـتی خـاوەنی نـاوی خۆیـان بوونایـە، هـەرگیز مـولائیم نەیـدەتوانی لـە قودرەت نزیك ببێەتەوە و دەستی بۆ بەریَ.

بۆ ئەوەی بەڕاستی ببیتە خاوەنی هەر ناوێك پێوستە سروشتت کتومت وەك ئەو ناوەبێت، پێویستە هەڵگری تایبەتمەندیەکانی ئەو ناوە و نیشاندەری ئەوان بێت. ئەگەر حەشمەت منـداڵێکی بـەدەن زلی مـەزن بووایـە و، مـولائیمیش کەسـێکی پەپولـە ئاسـای نـەرم ونیان بووایە، ئیدی ئەو ئەوکات دەکرا بڵێین خاوەنی ڕاسـتەقینەی ناوەکانیانن. لەڕاستیدا بە گوێرەی ئەوەی لە سـاڵانی داهـاتوودا چ کارێك ئەنجام دەدەیت، چۆن دەژیت و دەبیتـە چ جۆرە کەسـێك، ناوێك یان زیاتر دەست دەخەیت.

بۆ وێنەی بابەت دەنووسین، ناوی نووسەرت لیَ دەنرێت.

وێنەی دەکێشێت، ناوی وێنەکێشت لێی دەنرێت.

ئـەو کەسـەی کـە نوسـینەکانت دەخوێنێتـەوە پێـت دەڵێـت (نووسەر)، ئـەوەی وێنـەکانت ببینێـت دەڵێت وێنـەکێش. ئـەوەی

هەندێك زیاتر لێی وردببێتەوە تێدەگات تۆ چۆن نوسەرێك یاخود چۆن وێنەكێشێكیت. توانای (نووسەری) و (وێنەكێشی) تۆ لە نووسین و وێنەكاناتدا دەردەكەوێت.

ئەگەر خەڵكی خودی خۆیشت نەبینن، بە تێڕوانینی نوسین و وێنەكانت دەزانن نووسەر و وێنەكێشیت. پێدەچێت كورت و درێژی بالآت، ڕەنگی قژت و چاوەكانت، شێوازی ڕوخسارت نەزانن، وەلێ دەربارەی نووسەری و وێنەكێشیت دەتوانن ببنە خاوەنی گەلێ زانیاری.

بەدەر لەمانەش كۆمەڵێك تایبەتمەندی كارەكتەری تۆ بەتێپەڕبوونی كات خۆمان نیشان دەدەن، دەبنە ناوێك بۆت.

بۆ وێنە ئەگەر مەردووم بینیان كە تۆ هەمیشە حەز بەوە دەكەیت دیاری بەسەر دۆست و هاوڕێیاندا ببخشیتەوە، یارمەتی هەژاران بدەیت و پێداویستی موحتاج دابین بكەیت، ئەوكات ناوی (سەخی) یاخود (بەخشندە)ت لێ دەنێن.

كەسێكی بەسۆز و شەفەقەت بیت، ناودەنرێیت (مشفیق) و كەسێكی زانابیت ناو دەبرێیت (زانا).

كەسێكی زۆر جێی متمانە و باوەڕپێكراوبیت پێت دەڵێن (ئەمین) واتە (ئەمانەت پارێز).

وەلێ هیچ کام لەم ناو و سیفەتانە لەسەر پێناسەکەت نانوسرێت، کەچی لە ناوە نووسراوەکەی پێناسەکەت گەلێ زیاتر خاوەنی ئەو ناو و سیفەتانەیت و زیاتر تۆ دەناسێنن.

بێگومان ئەم مێشکە چکۆڵەی ئێمە هەرگیز توانای تێگەشتنی لە زاتی مەزنی پەروەردگاری نییە. گەر لەم گەردوونە بێ سەروبنەی لەبەرچاوەکاندایە تێنەگەین ئیدی چلۆن دەتوانین لەو زاتەی گەردوونی لە نەبوونەوە هێناوەتە بوون، تێبگەین. بەڵکو تەنیا لەڕێگەی ڕوانین لە بەدیهێنراوانی ئەوەوە دەتوانین لە چۆنێتی خودای گەورە تێبگەین.

بەوێنەی ڕوانین بۆ پەرتوکەکانی نووسەرێك ئەگەر بڕوانینە پەرتوکی گەردوون، بەوێنەی تەماشاکردنی تابلۆی وێنەکێشێك ئەگەر تەماشای ئاسمانەکان و زەوی بکەین و وردبینەوە، دەتوانین فێری گەلێك زانیاری ببین دەربارەی بەدیهێنەرمان.



لەسەر لاپەڕەکانی کتێبی مـەزنی گـەردوون کـە وشـەکانی پێك هاتوون لە پیتی ئەتۆم و هەسارەکان، هەر لە خـۆرە مەزنەکانـەوە تاکو مێرولە گچکەکان و هەر نووسینێکی قەڵەمی توانستـی خـوای گەورە وەك پەنجەرەیەك بەڕوومانـدا دەکرێنەوە و ناوە جوانـەکانی زاتی ئەو وەك خۆری درەوشاوەی ئاسمان دەردەخەن.

ئەمانەی خوارەوە چەند نمونەیەکن لەو ناوانـەی هـەر زوو دێنـە یادمان:

* ئـەو خودایـەی کـە زۆر زۆر بەخشـندەیە بەرامبـەر هـەموو بەدیهاتوانی (الرحمن)ە. نیشاندەرێکی ئەو ڕەحمەتەیشی، سـۆز و میهرەبـانی بـێ پایـانی دایکـان و هـەڵقوڵانی شـیرێکی شـیرین لـە سنگی دایکانی جیهاندا بۆ بەخێوکردنی کۆرپەکانیان.

* ئەو خودایەی کە تاکو ناکۆتـا دوورە لـە هەرشـتێکی ناشـرین (القدوس)ە. لە پەڕی باڵندەکانەوە بگرە تاکو گـەڵای درەختـەکان بەخاوێنترین شێواز دروست دەکات.

* ئـەو پـەروەردگارەی هـەموو ئـەو ئەسـتێرە، خـۆر، مـانگ و هەسارانەی لـە قوڵایـەکانی ئاسمانـدا بەوشـێوەی خـۆی دەیـەوێت هەڵدەسوڕێنێت، بێگومـان خـاوەنی هێزێکـی نەبڕاوەیـە تـاکو ئـەو کـارەی پـێ ئـەنجام بـدات. بەئەنـدازەی مـەزنی و نـەبڕاوەیی گەردوون، مەزنی و نەبڕاوەیی گەورەیی و توانسـتی خـۆی نیشـانی

هەر کەسێك دەدات کە سەرێك بەرزبکاتەوە و نیگایەك لەئاسمان بکات. بەم جۆرە لاپەڕەی ئاسمان کە بەپیتی هەسارەکان لە سەری نوسراوە دەرخەری هەردوو ناوی (القادر و المتکبر)ی خوای گەورەیە.

* ئەو خودایەی هەمووشتێکی لە نەبوونەوە هێناوەتە بوون (الخالق)ە. هەرچیەك هەبێت لەبەرئەوەی ئەو فەرموویەتی (ببە) بۆیە هەیە.

* ئەو خودایەی میوەکان، گوڵەکان، زیندەوەرانی بە هەمەچەشن و جیاواز بەدیهێناوە (الباريء)ە.

* ئەو خودایەی کە ڕوخساری مرۆڤ، بەئەندازەی مشتێك دەبێت، دروستکرد بەجۆرێك کە هیی هیچ کەسێك لەسەر زەویدا بە تەواوی لە هیی کەسێکی دیکە نەچێت، ناوێکی دیکەی (المصوِّر)ە.

*ئەو خودایەی لە جێگاگەلی وەهاوە کە ئەسڵەن بیرمان بۆی ناچێت نیعمەتی جۆراوجۆرمان بۆ دەنێرێت (الوهاب)ە.

* ئەو خودایەی بەگوێرەی هەموو گەروو و گەدەیەك خۆراکی دروستکردووە (الرزاق)ە.

* ئەو خودایەی لەوەرزی بەهاردا دەرگا لەسەر تۆوە بەفر گرتووەکانی وەرزی زستان ئاوەڵادەکات (الفتاح)ە. هەموو دەرگا

داخراوەکـــان دەکاتـــەوە، دەرگـــای تۆوەکـــان، دەرگـــای دڵـــە داخراوەکان و دەرگای ژیرییەکان...

* ئەو خودایەی نیعمەتی بیستنی بەخشیوەتە ئێمە بێگومـان خۆی بیسەری ڕهایە. یەکێك لە ناوە پیرۆزەکانی (السمیع)ە.

* ئەو خودایەی هەستی بینینـی بەخشیووەتە ئێمـە، بینـەری هەموو شتێکی گەورە یاخود بچوکە لـە تـاریکی یـاخود ڕوناکیـدا. لەهـــەموو چـــاوە بینەرەکانـــدا نـــاوی پـــیرۆزی (البصـــیر) دەدرەوشێتەوە.

* ئەو خودایـەی کـە هـەموو تایبەتمەنیـەکانی درەختێـك لـەناو تۆوەکەیدا دەنوسێتەوە و دەیپارێزێت (الحافظ)ە.

هـەموو تـۆوێکی درەخـت کـە سـەرەتا لـەژێر خاکدایـە و ماتـە، پاشان کاتی خۆی هات لەزەویەوە سەر دەردێنێت، نـاوی پـیرۆزی (الحافظ) نیشان دەدات...

* ئەو خودایـەی کـە بـاران بـۆ تۆوەکـان، شـیر بـۆ کۆرپـەکان، هێلانە بۆ باڵندەکان و لەسینەی دایکاندا خۆشەویستی بۆ منـداڵان فەراهم دێنێت، دەزانێت هەرکەسێك پێویستی بەچییە و بـەو پێیـە پێیٚ دەبەخشێت. یەك لەناوە جوانەکانی ئەو (المقیت)ە.

* ئەو خودایەی کە لە شادەمارمان زیاتر لە ئێمە نزیکترە، یەك لەناوە پیرۆزەکانی (الرقیب)ە. لە هەموو شت و کەسێك لێمانەوە نزیکترە.

* ئەو خودایەی نیعمەتەکانی لە ژماردن نایەن و سەخاوەتمەنیەکانی بێ ئەندازەن (الکریم)ە.

* ئەو خودایەی ئێمەی لە هەموو شتێك زیاتر خۆش دەوێت، ئێمەش ئەومان لە هەموو شتێك زیاتر خۆشدەوێت. خودا (الودود)ە و لە هەموو کەس زیاتر ئەو شیاوی خۆشویستنە.

* خودا هەردەم دۆست و یارمەتیدەری بەندە چاکەکانیەتی و (الولي)ە.

* ئەو خودایەی کە زانایە بە ژمارەی یەکە بەیەکەی بەدیهاتووانی، هەرلە هەسارەکانەوە هەتاوەکو گەڵای درەختەکان، هەرلە پەڕی باڵندەکان تاکو دڵۆپەکانی بارانی بەهاران... (المحصي)ە. خودا دەزانێت هەموو ساڵێك چەند خونچە دەکرێنەوە، چەند گوڵ بەیبوون لەنێوەندی سەوزایی چیمەنەکاندا سەردەردێنن، هەموو ساڵێك چەند منداڵ بەڕووی دایکیاندا زەردەخەنە دەکەن و چەند لیتر شیریان پێویست دەبێت بۆ ژیان... خودا هەموو ئەمانە دەزانێت چونکە خۆی هەموویانی بەدیهێناوە.

* ئەو خودایەی کە گەڵا ڕزیووە مردووەکانی پایز لە بەهاردا دانە بەدانە زیندوو دەکاتەوە، ئەو خودایەی پاش مردن زیندوو دەکاتەوە (المعید)ە.

* ئەو (المُحیي)ە کە ڕووی زەوی پڕکردووە لە زیندەوەری فرەچەشن و بێ ئەندازەی زۆر. ژیان هیی ئەوە و تەنیا ئەو دەتوانێت ژیان ببەخشێت... ئەو (الحی)ە.

خودا خاوەنی ئەمانە و چەندین ناوی جوانی نەبڕاوەی وەك ئەمانەیە. تاچەند ئاشنای ئەو ناوانەبین، کاتێك دەڵێین (الله) یاخود (خودا) ئەوکات باشتر دەزانین کە لە کام خودا دەپاڕێینەوە و داوای یارمەتی لێ دەکەین.

لەکاتی برسێتیدا داوای ڕۆزی لەو دەکەین، لە نەخۆشیدا داوای شیفا لەو دەکەین، لەکاتی ترسدا هانا بۆ لای ئەو دەبەین، کاتێك دەستەوسان دەبین لەبەردەم کارێکدا تەنیا دەست بۆ ئەو بەرزدەکەینەوە، بۆ دەستخستنی پێداویستییە بێ سنورەکانمان تەنیا لە دەرگانەی ئەو دەدەین...

خۆشویستنمان دەدەینە دەستی ئەو، هەموو ئومێدێکمان بەزاتی ئەوە. وەك خۆی دەفەرمێت: ((هەرگیز بێ ئومێد مەبن لە میهرەبانی من )). ئەو بە ناوەجوانەکانیەوە ئێمەی لە نەبوون هێنایە بوون، بوونمانی بە هەزار و یەك جوانی ڕازاندەوە.

مردن لەوەوە دەناسین و دووبارە زیندووبوونەوەش تەنیا لەو چاوەڕێ دەکەین... ئەو ئەو کەسەیە کە هەموو شتێك موحتاجی ئەوە، وەلێ ئەو موحتاجی هیچ شتێك نییە!

ئێمە ئەومان لە هەموو شتێك زیاتر خۆشدەوێت، دەشزانین کە ئەو ئێمەی لە هەموو شتێك زیاتر خۆشدەوێت ... چاوەڕوانی بەهار و باخچەکانی بەهەشتیش هەر لەو دەکەین...

لە هیچ دەرگایەکی دیکە نادەین و دەست لە هیچ کەسێکی دیکە پان ناکەینەوە...

بە هەموو هەڵەکانمانەوە، بە هەموو کەموکورتیەکانمانەوە، بەوپەڕی هەژاریمانەوە، بەوپەڕی بێدەستەڵاتیمانەوە پەنا بۆ ئەو دەبەین و ئارەزووی دەستگیرۆیی سۆزی ئەو دەکەین.

ئەو پەروەرێنی ئێمەیە!

ڕەحمەتی ئەو هەموو شتێك دادەپۆشێت!

ئەو لێخۆشبوونی خۆشدەوێت!

